مەوسووعەی بەرەو باشتر پێگەیشتن و تێگەیشتن

12

عەلی باپیر



# بنەڕەتەکانی موسڵمانەتییەکی ڕاست وهاوسەنگ

2021-1442



**بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ**
**نووسین: عەلی باپیر**

چاپی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
عـــەلی بـــاپیر (نووسەر)
بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ
١٩٤ لاپـــەڕە
١٤ * ٢١ سـم
بابـەت : ئایینی
ISBN : 978-99-22-632-11-7

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (٢١٩) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خـەتی بـەرگ :** نـــەوزاد کۆیـــی
**دیزاینی ناوەوە :** زەردەشت کاوانی

مەوسووعەی

بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن

- کتێبی ١٢ -

# بنەڕەتەکانی موسڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ

نووسینی

عەلی باپیر

www.alibapir.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ
وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٢٠٠ ﴾ آل عمران.

# پێشکەش بێ

بەو مسوڵمانانەی بە عەقڵێکی هۆشیارو دڵێکی بێدارەوەو، بە شێوەیەکی هاوسەنگ: دوور لە بە زایەدان و زێدەڕۆیی، دینداریيەکی ڕاست و ساغ دەکەن و، لە قووڵایی ناخیانەوە، ڕەزامەندیی و بەخششی خوا داوا دەکەن.

# پێشەکی و ڕێ خۆشکردن

إنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَن يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾النساء .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾الأحزاب.

أَمَّــــا بَعْــــدُ:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ الله، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار.

مسوڵمانانی بەڕێز و خۆشەویست!

بێگومان گەورەترین و بەرزترین مەبەست (غاية) کە مرۆڤی مسوڵمان لە ژیانی دنیای دا بیهێنێتەدی و پێی بگات، بریتیە لە ڕەزامەندیی خوا (رضوان الله) وەك خوای کارزان و میهرەبان، فەرموویەتی:

﴿ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾ ﴾التوبة.

واتە: ڕەزامەندییش لە خواوە گەورەترینە (لە هەموو شتێك، تەنانەت بەهەشتیش) ئەوە سەرفرازیی مەزنە.

خواش سبحانه وتعالی تەنیا بەوە لە مرۆڤ ڕازیی دەبێ، کە شوێن ئایین و بەرنامە تێر و تەواوو بێ خەوشەکەی (ئیسلام) بکەوێ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای زانا و شارەزا، تەنیا ئیسلامی بە بەرنامەی ژیانی مرۆڤەکان پەسند کردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ۚ ﴿٣﴾ ﴾المائدة.

واتە: ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسندکردوون.

کەواتە: کەسێك شوێنی ئایین و بەرنامە پەسندکراوەکەی خوا عزوجل نەکەوێ، خوا لێی ڕازی نابێ و پەسندی ناکات.

بەڵام ئایا: هەر شوێنکەوتنێکی ئیسلام و، هەر جۆرە دینداریی و مسوڵمانەتییەك، لەلای خوا پەسندە؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو وەك چۆن مەرجە دەبێ تەنیا خوا بپەرستین، مەرجیشە کە تەنیا بەو جۆرەی دایناوە، بیپەرستین، هەروەها وەك چۆن پێویستە: تەنیا ئیسلام بەرنامەی ژیانمان بێت و، بەس شوێن ئەو ئایین و تێر و تەواوەی خوا بکەوین، بە هەمان شێوەش پێویستە: تەنیا بەو شێوە و

چۆنیەتییە پەسندكراوەش، شوێنی بكەوین و جێ بەجێی بكەین، كە خوای كاربەجێ دیاریی كردوە، لەمیانی ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەری كۆتایی خۆی (محمد)دا صلی الله علیه وسلم.

ئنجا بەڕێـــزان!

ئەم كتێبە {بنەڕەتەكانی مسوڵمانەتییەكی ڕاست و هاوسەنگ} ئامانج لێی دەستنیشانكردنی ئەو پایە و بنەڕەتانەیە، كە مسوڵمانەتیی و دینداریيەكی ڕاست و هاوسەنگیان لەسەر بنیات دەنرێ، لە ژیانی تاك و كۆی مسوڵمانان دا، بە هەموو ڕەهەندەكانیەوە، كە من هەوڵم داوە گرنگترین و سەرەكییترینی ئەو بنەڕەتانە، لە سی و یەك (٣١) دانەدا، كورت بكەمەوە.







بۆیەش گوتوومانە: {مسوڵمانەتییەكی ڕاســـت و هاوسەنگ} چونكە:

مسوڵمانەتیی و دینداریيەك لە لای خوای تاك و پاك، پەسندە، كە لە ڕووی خود و چییەت (ذات و ماهيّة)ەوە، ڕاست و تەواو بێ و، لە ڕووی شێوە و چۆنیەتیی (شكل وكيفية)ەوە، هاوسەنگ و نەلەخشاو بێ، هەڵبەتە هەتا لە كتێبی موبارەكی خواوەش نیزیكتر بین و، كارلێكی چاكتری لەگەڵدا بكەین، دینداریی و مسوڵمانەتییەكەمان ڕاستتر دەبێ و، هەتا بە ڕێبازی(محمد) پێغەمبەریشەوە صلی الله علیه وسلم، پابەندتر بین، پێی ئاشناتر بین، مسوڵمانەتیی و دینداریيەكەمان، هاوسەنگتر دەبێ.



شایانی باسیشە: ئەم كتێبە لە پێنج بەش پێكهاتوە، بەمجۆرەی خوارێ:[1]

بەشی یەكەم: حەوت پایەی كۆكەرەوەی ئیسلام.

بەشی دووەم: هەشت بنەمای پێویست، بۆ ڕاست تێگەیشتنی ئیسلام.

بەشی سێیەم: هەشت پایەی سەرەكیی، بۆ دروست پێكەوە مامەڵە كردنی مسوڵمانان.

بەشی چوارەم: حەوت ڕۆشنكەرەوەی، شێوازی كاری پاكسازیی و چاكسازیی.

بەشی پێنجەم: هاوسەنگیی (إتِّزان) بناغەی كەسایەتیی (شخصیة)ی مسوڵمانە.



هیواداریشم هەموو لایەكمان بوێرانە و دڵسۆزانە و وردبینانە و، دووربینانە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو سی (٣١) بنەڕەتەدا، چاوێكی

---

(١) - لە كۆی ئەو سی و یەك (٣١) بنەڕەت (أصل)ە، حەڤدە (١٧) یان، لە بەشی دەیەمی كتێبی پێنجەمی: {مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا} گوازراونەتەوە، (لاپەڕە:٢٢٧- ٢٧٦)و، سێزدە (١٣) شیان، لە كتێبێكی عەرەبی خۆم، بە ناونیشانی: {حوارات ساخنة حول قضايا راهنة: في ميادين الفكر والفقه والدعوة و السياسة} وەرگیراون، (لاپەڕە:٢٨٥- ٢٩٥- ٢٩٨- ٣٠٨) هی كۆتاییشیان باسێكی سەربەخۆیە كاتی خۆی نووسیومەو سەرجەمیان بوونە: سی و یەك (٣١) بنەڕەت، بێگومان لە هەردووك گواستنەوەو وەرگرتنەكەش دا، سووكە دەستكارییی و پاش و پێش و جێگۆڕكێ هەبووە، بۆ گونجانی زیاتر لە گەڵ سروشتی ئەم كتێبی دوازدەیەم و كۆتاییەی:( مەوسووعەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن)دا.



جیددیی بە مسوڵمانەتیی و دینداریی خۆمان دا بگێڕینەوە، لە هەردووك ڕووی فیکریی و کردەیی (تیۆریی و پڕاکتیکییەو) و، هەر هەڵە و پەڵە و لاریی و لاسەنگییەکمان تێدا بینی، لایبەرین و ڕاستی بکەینەوە.

٢٢ / ڕەجەب /١٤٤١ك

١٧ / ٣ /٢٠٢٠ ز

هەولێر







## دەستپێك

بەڕێـــزان!

لەم بەشی یەكەمە دا، حەوت بنەڕەت (سبعة أصول) لە (بنەڕەتەكانی مسوڵمانەتییەكی ڕاست و هاوسەنگ) وەك: (حەوت پایەی كۆكەرەوەی ئیسلام) دەخەینەڕوو كە ئەمانەن:

**پایەی یەكەم:** بووناسیی (معرفة الوجود)، ئەو بناغەیە كە كۆی ئیسلامی لەسەر بنیاتنراوە.

**پایەیی دووەم:** ئیمان، بەرهەمی بووناسییە.

**پایەیی سێیەم:** خواپەرستیی، هەڵقوڵاوی ئیمانە.

**پایەیی چوارەم:** تەزكیەو تەقوا، بەرهەمی خواپەرستیین.

**پایەیی پێنجەم:** ڕەوشتی پەسند، بەرهەمی ئیمان و خواپەرستیی و تەزكیەو تەقوایە.

**پایەیی شەشەم:** خێزان بناغەی كۆمەڵگای ساغ و تۆكمەیە.

**پایەیی حەوتەم:** بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی: دوا ئاڵقەی پابەندییە بە ئیسلامەوە.

لە سۆنگەی ئەوەشەوە كە لە كتێبەكانی پێشووی ئەم مەوسووعەیەدا، كەم و زۆر ئەو بنەڕەت و پایانەمان، لە ژێر ناوونیشانی دیكەدا شیكردوونەوە، لێرەدا بە كورتیی و گوشراویی، لەبارەیانەوە دەدوێین و،



ئەوەی لێرەدا پێویستە جەختی لەسەر بکەینەوە، ئەوەیە کە ئەو حەوت پایە کۆکەرەوەیەی ئیسلام، وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و، هەرکامێکیان بەوەی پێش خۆی و دوای خۆیەوە، بەستراوە.







## پایەی یەکەم

## بوونناسیی ئەو بناغەیە، کە کۆی ئیسلامی لەسەر بنیاتنراوە

خوێنەرانی سەنگین!

لە کتێبی پێنجەمی ئەم مەوسووعەیەدا، لە بەشی یەکەمی: (پایەکانی بوونناسیی)دا، بە درێژیی باسی بوونناسیی و پێنج پایە سەرەکییەکانیمان کرد و، لێرە پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات، بەڵام ئاماژە بە هۆکاری بناغە بوونی بوونناسیی (معرفة الوجود ـ ontology) دەکەین بۆ کۆی ئیسلام و دەڵێین:





زانایانی ئیسلام هەمیشە کە باسی ئیسلامیان کردوە، لە باسی ئیمانەوە دەستیان پێکردوە: ئیمان بە خواو فریشتەکان و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی و قەدەرو قەزا!

بەڵام من پێم وایە: ئیسلام پێش ئیمان، لە بوونناسیی (معرفة الوجود)ەوە دەست پێدەکات، مەبەستیشمان لە بوونناسیی ئەوەیە کە فەلسەفە بە درێژایی مێژوو خۆی، پێیەوە سەرقاڵ بووە، فەلسەفە بە گشتی: هی یۆنان و میزوپۆتامیا و هیندو چین و میصرو فارس و .... هتد، کە لە نهێنی بوون (سرُّ الوجود)ی کۆڵیوەتەوە:

١- ئەم بوونە چییە؟

٢- کێ خاوەنیەتی؟

٣- بۆچی هێناویەتە دی؟

٤- بۆ کوێ دەچێ؟



٥- من کێم؟

٦- بۆچی هاتووم؟

٧- سەرەنجامم چییە؟

ئەم پرسیارانەش جگە لە وەحیی خوا، کە بە پێغەمبەرانی خوادا نێردراوە،هیچ شتێك، وەڵامی ڕاست و دروستی نەداونەوە.

بە سەرنجدانی قورئانیش زۆر باش، دڵنیا دەبین کە خوای زاناو شارەزا، بە باسی ئیمان دەستی پێنەکردوە، بەڵکو بە بووناسیی دەستی پێکردە، واتە: ناساندنی گەردوون و بەدیهێنەرو ژیان و مرۆڤ. بۆ نموونە با سەرنجی ئەم ئایەتە بە پێزەی کتێبی خوا بدەین:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾هود.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژان (لە شەش قۆناغان دا) هێناونەدی و، بارەگاکەشی لەسەر ئاوێ بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی باشترە؟ ئنجا ئەگەر بڵێی بە بێگومان ئێوە دوای مردن زیندوو کراودن، بە جەختکردنەوە ئەوانەی دەڵێن: ئەم (قورئان)ە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە.

شەش بنەما سەرەکییەکەی بوونناسیی لەم ئایەتەدا:

یەك: [ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ]:

کەواتە: خوا عزوجل بەدیهێنەر و خاوەن و مشوورخۆری گەردوونە.

دوو: [فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ]:

یانی ئەم گەردوونە خوای کاربەجێ و، توانا بە شێوەیەکی پلە پلەیی (تدرج) دروستی کردوە، بە شەش قۆناغ، چونکە وشەی [أَيَّامٍ] کۆی (یوم)ە، (یوم)یش بەماوەیەك لەکات دەگوترێ بەبێ دیاریکردنی ئەندازەکەی.





سێ: [وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ]:

کەواتە: بەر لەوەی گەردوون بێتەدی، بەلای کەمەوە دوو دروستکراوی دیکەی خوا عزوجل هەبوون:

١- (عرش) تەخت (تەختی حوکمڕانیی).
٢- (ماء) ئاو.

چوار: [لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ]:

کەواتە: حیکمەت و ئامانج لە دروستکرانی گەردوون هەمووی، تێدا تاقیکرانەوەی مرۆڤانە (هەروەها جندیش).

پێنج: [وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ ]:



کەواتە: پاش ئەم ژیانەی دنیا کە جێی تێداتاقیکردنەوەیە، قۆناغێکی دیکەی ژیانیش هەیە کە شوێنی سزاو پاداشتەو ڕۆژی دواییە.

شەش: [لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ]:

ئەمەش هەڵوێستی چەسپاوی بێبڕوایانی عەقڵ داخراوو ئاستنزمە، کە لە جیاتی لێکۆڵینەوەو پشکنین، هەمیشە پەنایان بردۆتە بەر تۆمەتبارکردن و ناشیرین کردن.

بەڵێ ئیسلام بە هەموو بەش و پێکهاتەکانیەوە، وەك بینایەك لەسەر بناغەی بوونناسی وەستاوەو وەك گوتیشمان: پێشتر بە درێژیی لە بارەی بوونناسییەوە دواین، بۆیە لێرەوە بەم ئاماژەیە وازی لێ دێنین و، ئەوە دووبارە دەکەمەوە کە:

بۆ ناسین و ناساندنی ئیسلام پێویستە، لە بوونناسییەکەیەوە دەست پێ بکەین، نەك لە هەر بەش و پێکهاتەیەکی دیکەیەوە.

## پایەی دووەم
## ئیمان بەرهەمی بوونناسییە

هەڵبەتە مەبەستمان لە (بوونناسیی) بوونناسیی ئیسلامییە، یان بە تەعبیرێکی ڕاستترو فراوانتر: بوونناسیی هەڵقولاو لەسەرچاوی زوڵاڵی وەحیی ساغ و دەستکاریی نەکراوی خوا، کە بۆ سەرجەم پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خۆی ناردوویەتی و، تاکە بوونناسیی ڕاست و ڕوون و ڕەوانە.

بەڵێ هەر عەقڵ و دڵێك، بوونناسیی ڕاستەقینەی تێدا بچەسپێ و، خۆی و خوا، دەوروبەرو گەردوون بناسێ، ئەو ناسین و زانینە پاڵی پێوەدەنێ، بڕوا بە بەدیهێنەرو خاوەن و مشوورخۆری خۆی گەردوون بێنێ و، هەڵوێستێکی ئەرێنیی (إيجابي) و شایستە بەرانبەر بە خوا عز وجل پێشان بدات.

بەڵام لێرەدا مەبەستمان ئەوەنیە کە:

بە هۆی بوونناسیی ڕاست و دروستەوە، یەکسەر چییەتی ئیمان و پایەکانی و وردەکارییەکانیشمان بۆ دەردەکەون! چونکە وەك چۆن بوونناسیی (معرفة الوجود) پەکی لەسەر وەحیی کەوتوە، ئیمانیش بە هەمان شێوە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ، نازانرێ، وەك خوای زانا و شارەزا فەرموویەتی:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى.

بەڵکو وێڕای ئەوەی ڕابرد، مەبەستیشمان ئەوەیە کە:



١-بووناسیی بناغەی لەسەر وەستانی ئیمان و سەرچاوەی لێوە هەڵقوڵانیەتی.

٢- دەبێ لە هەوڵدان بۆ تێگەیشتن و تێگەیاندنی ئیسلامدا، خاڵی دەست پێك و سەرەتا: بووناسیی بێت، نەك شتێکی دیکە.

پێنج پایەکانی ئیمانیش [ئیمان بەخوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی] لە قورئان دا، باسکراون: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾ البقرة.

ئیمان بە قەدەریش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا، پاڵدراوەتە لای پێنج پایەکەی ئیمان: {الإِيمَانِ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٨.

شایەنی باسیشە:

(ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) هەڵەیە جگە لە وەسفی (ئیسلامیی) بە هیچ وەسفێکی دیکە بناسرێ، وەك: (سەلەفیی، صۆفیی، ئەشعەریی، خەلەفیی ... هتد)، چونکە خوای بەرزو مەزن بۆ خۆی لە قورئان دا، لەبارەی ئیمانەوە، نوختەی خستۆتە سەر پیت و، تەنانەت بۆ پێغەمبەریشی صلی الله علیه وسلم بەجێ نەهێشتوە، مسوڵمانانیش تەنیا یەك ئیمان و عەقیدەیان هەیە، کە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییە.

## پایەی سێیەم
## خواپەرستیی هەڵقوڵاوی ئیمانە

وەك چۆن ئیمان لەسەر بناغەی (بوونناسیی) بنیات دەنرێ، بگرە بوونناسیی خوازیاری ئیمان بە خوای بەدیهێنەرو خاوەنی گەردوونەو، خوازیاری ئیمان بە فریشتە نوێنەرەکانی خوایە، کە هیدایەت و بەرنامەی خوا بۆ پێغەمبەران: ڕەوانەکراوانی خوا، بێنن، هەروەها خوازیاری ڕۆژی دوایی و دیداری خواشە، بە هەمان شێوەش: ئیمان بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی، خوازیاری خواپەرستیی و بەندایەتی کردنە بۆ خواو، هەرکات مرۆڤ بەڕاستیی ئیمانی هێنا، ئیمانەکەی ناچارو واداری دەکات خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی خۆی بپەرستێ، هەر بۆیەش مەگەر چۆن ئەگەرنا هەرکات وشەی (إیمان) لە قورئاندا هاتبێ وشەی (العمل الصالح)یشی بە دوادا هاتوە: (آمنوا وعملوا الصالحات)، (آمن وعمل صالحاً)، کە بێگومان باشترین جۆری کردەوەی چاك خواپەرستییە، بۆیەش خوای کاربەجێ کردوویەتی بە حیکمەت و ئامانجی دروستکرانی مرۆڤ و جند:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات.

لە کتێبی شەشەمیش دا: (خواپەرستیی، تەزکیە، تەقوا) بە درێژیی لە بارەی خوا پەرستییەوە دواوین و، لێرە بەم ئاماژە کورتە وازی لێ دێنین.

## پایەی چوارەم
## تەزکیەو تەقوا بەرهەمی خواپەرستیین

بەڵێ بەڕێزان! هەرکام لە تەزکیە بوونی نەفس: پاك و چاکبوون و گەشەکردنی و، پارێزکاریی زادەو بەرهەمی خواپەرستیین، بە هەردووك چەمکەکەی خواپەرستیی:

١- چەمکی گشتیی و ڕاستەقینەی: ئەو پەڕی خۆشویستن و بە مەزنگرتن و، سام و هەیبەت لێکردن و، پشت پێ بەستن و مل بۆ کەچکردن، بۆ خوا عزوجل.

٢- چەمکی تایبەتی و عورفیی: دروشمەکانی خواپەرستیی (شعائر العبد).

مەبەستیش لە تەزکیەی نەفس ئەوەیە کە: دڵ و دەروون و ناخی مرۆڤ پاك بێتەوەو بشۆرێ لە چڵك وچەپەری خوو و خدەو سیفەتە نزم و پەستەکان و، بڕازێتەوە بە ئاکارو خەسڵەتە بەرزو پەسندەکان و سەرەنجام: شایستەیی ئەوەی هەبێ، میوانی تەقوا پێشوازیی لێ بکات و بیحەوێنێتەوە.

پارێزکاریی (تقوى)یش ئەوەیە کە مرۆڤ حاڵەتێکی وای بۆ دروست بێ، هەمیشە چاودێریی خۆی بکات لە بەرانبەر خوادا کە هیچ فەرمانێکی - بە فەرز و سوننەتەوە - نەچوێنێ و، هیچ قەدەغەیەکیش - بە حەڕام و ناپەسندەوە - نەشکێنێ، چونکە (راغب الأصفهاني) لە پێناسەی تەقوادا گوتوویەتی: (وَصَارَ التَّقْوَى فِي تعَارف



الشَّرْعِ: حِفْظُ النَّفْسِ عَمَّا يُؤْثِم)[1]، یانی: تەقوا لە زاراوەی شەرعدا، خۆپاراستنە لە هەر گوناهبارکەرێك، هەڵبەتە گوناهەکانیش بە گشتی دوو جۆرن:

١- چواندنی ئەرکەکان (ترك المأمورات)

٢- شکاندنی قەدەغەکان (ارتكاب المحظورات).

پێشتریش لە کتێبی شەشەم دا، بە درێژیی باسی هەکام لە: تەزکیەو تەقوامان کردوە.





---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٨٨١، دار القلم، ط٣ / ٢٠٠٢م.



## پایەی پێنجەم

## ڕەوشتی پەسند، بەرهەمی ئیمان و خواپەرستیی و تەزکیە و تەقوایە

بەڵێ ڕەوشتی پەسندو ئاکاری جوان، میوەیەکە لە درەختی ئیمان و خواپەرستیی و تەزکیەو تەقوا، پەیدادەبێ، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (محمد) صلی الله علیه وسلم ڕەوشتی بەرزو پەسندی لەگەڵ خواپەرستیی و پارێزکاریی دا، یەکسان کردوەو فەرموویەتی: {إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ، دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد: ٤٧٩٨، وَابْنُ حِبَّانَ:٤٨٠، وَأَحْمَد: ٢٤٣٩، وَصَحَّحَهُ لألبَانِي.



واتە: مسۆگەر بابای بڕوادار بە ڕەوشتی بەرزو جوانی، دەگاتە پلەی بەردەوام شەو نوێژکەری ڕۆژووگر.

هۆکاری ئەوەش ئەوەیە، کە مرۆڤ کاتێك دەتوانێ ڕازاوەبێ بۆ ڕەوشتی بەرزو پەسندو ئاکاری جوان و ڕەند، کە خواپەرست و پارێزکاربێ و، خاوەنی نەفسێکی پاك و چاك (مُزَكَّاة) بێ.

کتێبی نۆیەم: (ڕەوشتبەرزیی: دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان) یشمان بۆ قسەکردن لە بارەی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندەوە، تەرخانکردوە، بۆیە لێرە بەم ئەندازەیە لێی دەگەڕێین.

## پایەیی شەشەم

## خێزان بناغەی کۆمەڵگای ساغ و تۆکمەیە

بابەتی خێزان و پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد لە لایەکەوەو، دایك و باب و ڕۆڵەکانیان لەلایەکی دیکەوەو، خێزانەکان پێکەوە لەلایەکی دیکەوە: بابەتێکی یەکجار گرنگ و هەستیارەو، بەندە پانتاییەکی باشم بۆ قسە لەسەرکردنی لە بەرهەمەکانی خۆم دا، بۆ تەرخانکردوە، چونکە وێڕای: (مەوسووعەی: ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا)، لە کتێبی یازدەیەمی: (مەوسووعەی: الإسلام کما یتجلی فِي کتاب الله)یش دا قسەم لەبارەوە کردوەو، لە کتێبی پێنجەمی: (مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی ..)یش دا بەشێکم بۆ داناوە.





بە دڵنیاییەوەش خێزانانێك دەگونجێ ببنە بناغەی کۆمەڵگەیەکی ساغ و سەلیم و تەندروست، کە لە خودی خۆیاندا ساغ و تۆکمە بن و، ئەویش کاتێك دەبێ کە تاکە پێکهێنەرەکانیان (الأفراد المکوِّنون) ساغ و تەواو بن. ئەوانیش - بە پلەی یەکەم ژن و مێرد و دایك و بابەکان - کاتێك ساغ و ڕێك و پێك دەبن، کە بە ئیمان و خواپەرستیی و تەزکیە و تەقواو ڕەوشت و خووی بەرزەوە پەروەردە کرابن.

کەواتە:

ئەگەر بمانەوێ خێزانەکان مەحکەم و پاك و چاك بن - بە تایبەت لەم ڕۆژگارەدا کە کاری تێکدەرانەی بێڕەزاو سەخت دەکرێ لە دژی خێزان و بەهاو ڕەوشتە بەرزە مەعنەوییەکان - دەبێ کاری جدیی



بکەین لەسەر تێگەیاندن و پێگەیاندنی تاکی مسوڵمان: ئیماندارو خواپەرست و تەزکیە کراوو پارێزکارو ڕەوشتبەرز.

پاشان بنیاتنانی خێزان لەسەر بناغەیەکی مەحکەم و، دواتریش و چاودێریی کردنی و ئاگا لێبوونی و مشوورلێخواردنی و پاراستنی.



## پایەی حەوتەم

## بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی: دوا ئاڵقەی پابەندییە بە ئیسلامەوە

بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی (دەوڵەت) لە ئیسلام دا، لە خودی خۆیدا ئامانج نیە، بەڵکو ئامرازەو، پاشان دوا قۆناغی پابەندیی بە ئیسلامەوەو، جێبەجێ کردنی شەریعەتەکەیەتی، واتە: دەبێ پێشتر لە لایەن کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمانانەوە، سەرجەم بوارەکانی ئیسلام جێبەجێ کرابن و هەزم کرابن:



١- بوونناسیی،

٢- ئیمان و عەقیدە،

٣- تێڕوانینەکان و بەهایەکان و پێوەرەکان (التصورات والقیم والموازین)،

٤- خواپەرستیی،

٥- تەزکیەو تەقوا،

٦- ڕەوشت و ئاکارە بەرزو پەسندەکان،

٧- ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان ..

ئنجا دوای ئەوە کۆمەڵگا شایستەی ئەوە دەبێ کە لە بوارەکانی حوکم و سیاسەت و ئیدارەو ئابووریی و پەیوەندییەکان و جەنگ و ئاشتیی و ... هتددا، بە شەریعەتەوە پابەند بێ، ئەم ڕاستییەشمان بۆیە خستە ڕوو، چونکە:

زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵ و ڕێکخراوە، لە پێناو ئیسلامدا، تێکۆشەرەکانی ئەم ڕۆژگارەمان، هەر خەون بە دەوڵەتی ئیسلامییەوە دەبینن و، پێیان وایە بەرزترین ئامانج و مەبەستەو، هەر کۆمەڵ و ڕێکخراوێك بەو ئامانجە نەگات، مانای وایە: بە ئامانج نەگەیشتووەو بێ مراد بووە!

کە لە ڕاستیی دا ئەوە ڕاست نیەو، ئەگەر بێت و کارو هەوڵ و خەباتی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (علیهم الصلاة والسلام) بەو تەرازووە لاتەڵە هەڵسەنگێنین، - دەبێ بڵێین: زۆربەی هەرە زۆریان بێ مراد بوون! چونکە بە پێی ئەوە کە خوا لە قورئاندا بۆی گێڕاوینەوە لە بەسەرهاتەکانیان - تەنیا ژمارەیەکی بە پەنجەکانی دەست ژمێردراو، توانیویانە قەوارە سیاسیی تەواو یان نیوە چڵ، دروست بکەن:

١- نووح (علیه السلام) دوای طۆفان.

٢- مووسا (علیه السلام) کە قەوارەیەکی سیاسیی بۆ بەنو ئیسرائیل لە بیابانی سینادا پێکهێنا.

٣و٤ - داوود و سولەیمان علیهما السلام کە هەم پێغەمبەرو، هەم حوکمڕانیش بوون و، خاوەن قەوارەی سیاسیی بوون، بەڵام تەنیا لە فەلەسطین و ئەو پەڕەکەی شامیشدا هەمووی.

٥- ئیبراهیم علیه السلام کە خوای کارزان و میهرەبان جۆرێك لە موڵك و دەسترۆیشتوویی، پێداوە، هەرچەندە زیاتر وا پێدەچێ لە ڕووی ئابوورییەوە بووبێ:

﴿ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾ ﴾ النساء.

٦ـ موحەممەد صلى الله عليه وسلم کە قەوارەیەکی سیاسیی دروستکردو، دواتر چوار جێنیشینە سەرڕاست و هیدایەتدراوەکان (أبو بكر و عمر و عثمان و علي) خوا لێیان ڕازی بێ، فراوانیان کرد تاکو بەشێکی زۆری دنیای ئەوکاتەی گرتەوە.

بەڵێ بەڕێــزان!

پێکهێنانی قەوارەی سیاسیی، یان بە دەستەوە گرتنی جڵەوی حوکمڕانیی و ئیدارەی کۆمەڵگا، نەك هەر گەورەترین ئامانج و لووتکەی هیواو مەبەستی کارو جموجۆڵی ئیسلامیی و دینداریی مسوڵمانان نیە، بگرە لە خودی خۆیشی دا، ئامانج نیەو، تەنیا ئامرازەو، ئەو پەڕی دەتوانین بڵێین: ئەویش یەکێکە لە ئامانجەکان، ئنجا ئەگەر مسوڵمانان پێی گەیشتن، باشە، بەڵام ئەگەر وەك زۆربەی هەرە زۆری پێغەمبەرانی خوا (صلى الله عليهم وسلم)، بۆیان نەلوا بیهێننەدی، ئەوە بێگومان ئەمانە هەموویان و زۆری دیکەش، ئامانج و مەبەستی گرنگ و گەورە گەورەن، کە لە میانی دینداریی و مسوڵمانەتیی خۆیان و مشوور لێخواردنی کۆمەڵگاو دەوروبەریان دا، دەتوانن، دەستەبەریان بکەن:





١- هێنانەدی بەندایەتیی (عبودیة) لە خودی خۆیاندا، بۆ خوا تبارك وتعالى.

٢- ناساندنی خوای بەرزو مەزن بە خەڵکی و، بانگەوازکردنیان بۆ لای ئایین و بەرنامەکەی.

٣- خەڵك کردنە بەندەی خواو، تێگەیاندنیان لە ڕاستییەکانی ئایین و بەرنامەکەی.



٤- بڵاوکردنەوەو ڕەواج پێدان و چەسپاندنی خەسڵەتە بەرزو پەسندە کەسیی و کۆمەڵایەتییەکان، کە قورئانی بەڕێز باسی کردوون و، پێغەمبەری خوا (محمد) لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا، بەرجەستەی کردوون.

٥- ڕیشەکێش کردنی خەسڵەت و ڕەفتارە، دەروونیی و کردەییەکان، لەسەر ئاستی تاك و کۆ، تێکڕای ئەو کار و ڕەفتارانەی کە شەریعەتی خوا، قەدەغەی کردوون.





## دەستپێك

بەڕێـــزان!

لەم بەشی دووەمە دا، هەشت (٨) بنەمای گەورەو گرنگمان دیاریی كردوون، كە پێمان وایە ڕەچاوكردن و كارپێكردنیان و، پێوە پابەند بوونیان، ڕۆڵێكی كاریگەر دەگێڕێ لە ڕاست و دروست و هاوسەنگ تێگەیشتنی ئیسلام دا، ئەوانیش ئەمانەن:

**بنەمای یەكەم:** ئیسلام تەنیا لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە.

**بنەمای دووەم:** بەبێ تێگەیشتنی قورئان، نازانین ئیسلام چیەو، بەبێ گرتنی ڕێبازی پێغەمبەریش، نازانین قورئان چۆن جێ بەجێ بكەین!

**بنەمای سێیەم:** بناغەی دینداریی ڕاست و كاری ئیسلامیی بەجێ، ڕاست تێگەیشتنی ئیسلامی بەرجەستەیە لە قورئان و سوننەت دا.

**بنەمای چوارەم:** ئیسلام بەبێ نوێكردنەوە - تازەكردنەوەی لێتێگەیشتنی - لە ژیان و گوزەران بەجێ دەمێنێ.

**بنەمای پێنجەم:** بناغە لە بواری ئیمان و خواپەرستیی دا: شوێنكەوتنی وەحییە، بەڵام لە بواری هەڵسوكەوتەكان دا، بناغە دەستكراوەیی و داهێنانە، بە مەرجی دژ نەوەستان لەگەڵ وەحیی دا.

**بنەمای شەشەم:** شەریعەت لە بواری چەسپاوەكان (ثوابت)دا، چۆتە نێو وردەكارییەكانەوە، بەڵام لە بواری گۆڕاوەكان (متغیرات)دا، بە كورتیی و گشتیی (إجمال) دواوە.



**بنەمای حەوتەم:** وەك چۆن ئەسڵ لە شتان دا، پاکییەو، لە هەڵسوکەوتاندا، ڕەواییەو، لە کەسەکاندا، ئەستۆ پاکییە، بە هەمان شێوەش: ئەسڵ لە مسوڵمانانیش دا، مسوڵمانەتییە، هەتا پێچەوانەکەی بە بەڵگەی دڵنیاکەر دەچەسپێ.

**بنەمای هەشتەم:** قورئان کردنە پێوەرو تەرازوو، بۆ ڕێژەی گرنگیی و بایەخ پێدانی شتەکان.

بەڵێ خوشك و برا مسوڵمانە خۆشەویستەکانم!

پێم وایە ئەگەر ئەم هەشت (٨) بنەما گەورەو گرنگە ـ کە ئایەتەکانی قورئان و، دەقەکانی ڕێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و، عەقڵ و زگماکی ساغ و تەواو، شایەدو بەڵگەیانن ـ ڕەچاو بکرێن و پابەندییان پێوە بکرێ، مسوڵمانان تێگەیشتنێکی ڕێك و ڕاست و هاوسەنگیان بۆ ئایین و بەرنامە هاوسەنگ و تێرو تەواوەکەی خوای پەروەردگار دەبێ و، بەملاولادا ڕێیان لێ تێکناچێ.









## بنەمای یەکەم

## ئیسلام، تەنیا لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە

ئەم ڕاستییەمان زۆر جار گوتۆتەوە، بەڵام هەتا بگوترێتەوە، هەر دەیهێنێ، چونکە دەردی کوشندەی مسوڵمانان ئەوەیە کە وێڕای وەحیی، شتی دیکەشیان لەخۆیان کردۆتە دین، مەبەست لەم ناوونیشانە، ئەوەیە کە جگە لە قورئانی بەپێز و ڕێبازی پێغەمبەری بەڕێز موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، ئەوی دیکە هەرچی کە لەبەر دەستی مسوڵماناندا هەیە، لە:


39


١- تەفسیرەکانی قورئان.

٢- ڕوونکردنەوەکانی سوننەت.

٣- کتێب و بەرهەمەکانی بوارەکانی: بووناسیی، ئیمان و عەقیدە، عیبادەت، تەزکیەو ئەخلاق، فیقە، ئوصووڵی فیقهـ، سیرە و مێژوو... هتد.

هەمووی بە تێگەیشتنی مسوڵمانان بەگشتی و زانایان بە تایبەت، لەبارەی ئیسلامەوە دادەندرێ، نەك بەخودی ئیسلام، کەواتە: بێجگە لە قورئان و سوننەت، کە وەحیی خوایان تێدا کورت هەڵاتوە، هیچ شتێکی دیکە وەك ئایین پابەندکەر (مُلْزِمْ) نیە بۆ مسوڵمانان، کە نەتوانن لێی لابدەن، بۆ وێنە: ئەبووبەکر (رضي الله عنه)، یان عومەر (رضي الله عنه) شتێکیان گوتوە، ئایا بۆ ئێمە دەبێتە دینێکی پابەندکەر؟ نەخێر، بەڵێ ئەگەر بڵێن: خوا وایفەرمووە



و ئایەت بخوێننەوە، یان فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بگێڕنەوە، ئەو کاتە ئەوان نەقڵی ئایەتەکەو نەقڵی فەرمایشتەکە دەکەن، بەڵام ئەگەر بۆچوونێکی خۆیان بێ، بە ئایین دانانرێ، بۆیەش نموونەم بە ئەبووبەکرو عومەر هێنایەوە خوا لێیان ڕازی بێ، چونکە لە دوای پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) لەوانمان بەڕێزترو گەورەترو خۆشەویستتر نیە، پێیان گوتراوە: هەردووك وەزیرەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام تەنانەت ئەوانیش، قسەکانیان هەر بۆچوونی ئەوانە، دەربارەی ئەو بابەتە کە لێی دواون، وەك گوتمان: ئەگەر ئایەت بێ، ئەوە ئایەت ئایەتەو، ئەگەر فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێ، ئەوان نەقڵیان کردوە، بەڵام ئەگەر تێگەیشتن بێ لە ئایەت، یان تێگەیشتن بێ لە فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، تەماشای دەکەین: دەگونجێ پێکابیان و، دەشگونجێ نەیانپێکابێ، هەرچەندە بە تەئکید هاوەڵان بەگشتی خوا لێیان ڕازی بێ و، لە نێویاندا چوار خەلیفە ڕاشیدەکان، پێمان وایە لە هەموو کەس باشتر لە ئیسلام تێگەیشتوون و، لە هەموو کەسیش باشتر پێوەی پابەند بوون، بەڵام هەر چۆن بێ: بۆچوونەکانی ئەوان و تێگەیشتنی ئەوان، بەتێگەیشتنی ئەوان دەربارەی ئیسلام دادەندرێ، نەك بەخودی ئیسلام.

کۆتایی ئەم بنەمایەش بەهێنانەوەی ئەم ئایەتە دێنین، کە بەڵگەو بناغەی ئەوەیە کە گوتمان:

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا (٦٩)﴾ النساء

واتە: هەرکەس فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکات، ئەوانە (لەڕۆژی دوایی) لەگەڵ کەسانێکدان کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون، لەپێغەمبەران و صیددیقان و شەهیدان و ساڵحان و ئەوانەش چاکترین هاوەڵن.



## بنەمای دووەم

## بەبێ تێگەیشتنی قورئان، نازانین ئیسلام چییەو، بەبێ گرتنی ڕێبازی پێغەمبەریش نازانین قورئان چۆن جێبەجێ بكەین

بەڵێ بەڕێزان! بەبێ لێتێگەیشتنی قورئان، كە نەخشەی گشتیی ئیسلامی گرتۆتە خۆی، نازانین ئیسلام چییە و چۆنە؟ هەربۆیەش نەك هیچ كتێب و بەرهەمێكی هیچ زانا و پێشەوایەك، ناكرێ و ناشێ بكرێتە جێگرەوە (بدیل)ی قورئان بۆ ناسینی ئیسلام و لێتێگەیشتنی، بگرە ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) جێگرەوە (بدیل)ی فەرمایشتی بەرز و بەپێز و بێ وێنەی خوا عزوجل نیە، چونكە بێگومان پێغەمبەری خوا، هەموو ئەو ڕاستیی و پایە بنەڕەتیی و ئامانج و مەبەستە گەورە و سەرەكییانەی ئیسلام، كە خوای كاربەجێ و زانا لەقورئان دا فەرمووني و، بەباشترین شێواز خستوونیە ڕوو، مەگەر جاروبار بۆ جەختكردنەوە و داكۆكییكردن، یان بۆ ڕوونكردنەوەی وشەیەكی مانا ناڕوون، بۆ هەندێك لە هاوەڵان، ئەگەرنا بەتەمای قورئان، لەو ڕاستییانەی ئیسلام گەڕاوە و باسی نەكردوون، كەواتە:

هەركەس بەتەمابێ لەڕێی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) ئیسلام بناسێ، مانای وایە لەڕێی غەیری خۆیەوە بۆ ئامانجێك چووە و پێی ناگات، چونكە ئەركی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ناساندنی ئیسلام نیە، بەڵكو پێشاندانی چۆنیەتی جێ بەجێكردن و پڕاكتیزە كردنیەتی لەسەر ئەرزی واقیع.

هەربۆیەش: وەك چۆن بەبێ لێتێگەیشتنی قورئان، نازانین ئیسلام چییە؟ بەهەمان شێوەش:

بەبێ گرتنی ڕێبازی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ناتوانین قورئان پراکتیزە بکەین، واتە: هەتا لە قورئان تێ نەگەین، نازانین ئیسلام چییە، ئیسلام بە تیۆریی (نظري) لە قورئاندا بەرجەستەیە و، بەبێ گرتنی ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم)، ئێمە ناتوانین قورئان جێبەجێ بکەین.

کەواتە: ئیسلام وەك ئایین و بەرنامە، لەقورئاندا بەرجەستەیە و، وەك جێبەجێ کردن و لایەنە کردەییەکەشی، سوننەت لە ئەستۆی گرتوە، یانی: بە لێتێگەیشتنی قورئان، ئیسلام فام دەکرێ و، بەگرتنی ڕێبازی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەسەر ئەرزی واقیع و بەکردەوە، ئیسلام جێ بەجێ دەکرێ.



کۆتایی ئەم بنەمایەش بەم دوو ئایەتە دێنین، کە بناغە و هەوێننی:

١- ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الإسراء

واتە: بەدڵنیایی ئەم قورئانە بەرەو چاکترین و ڕاستترین، ڕێنمایی (خەڵك) دەکات و موژدەی پاداشتیکی گەورەش بەو بڕوادارانە دەدات کە بڕوادارن و کردەوە باشەکان دەکەن.

٢- ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾النور.



واتە: بڵێ فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەو ئەوەی پێی سپێرراوە لەسەریەتی و، ئێوەش ئەوەی پێتان سپێرراوە لەسەرتانەو، ئەگەر بەقسەی بکەن ڕێی ڕاست دەگرن و، پێغەمبەریش جگە لە گەیاندنی ڕوونی لەسەر نیە.



## بنەمای سێیەم

## بناغەی دینداریی ڕاست و کاری ئیسلامی بەجێ، ڕاست تێگەیشتنی ئیسلامی بەرجەستەیە لە قورئان و سوننەت دا

بەڵێ براو خوشکانی خۆشەویستم!

هەرکەسێك وەك بەندایەتیی و پەرستن بۆ خوای بەرزو مەزن عزوجل، پابەندبێ بە ئیسلامەوەو، بە شێوەیەکی ڕێك و پێك کار بۆ ئیسلام بکات، ئنجا بە تاکیی، یان لە میانی کۆمەڵێك، یان کۆمەڵەو ڕێکخراوێك، یان دامەزراوەیەك، یان دەزگایەك...،هتد دا، پێویستە بەر لە هەرشتێك:



یەکەم: بە شێوەیەکی قووڵ و ڕاست لە ئیسلام تێبگات، کە ئیسلامیش جگە لە قورئان و سوننەت شتێکی دیکە نیە، بەڵام ئایا تەنیا ڕاست و دروست تێگەیشتنی ئیسلام و ناسینی، لە دوو سەرچاوە ڕوون و زوڵاڵەکەی وەحیی دا، بەسە تاکو بتوانێ دایبەزێنێتە سەر ئەرزی واقیع؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو مەرجێکی دیکەش ماوە:





دووەم: دەبێ شارەزایی و بەرچاوڕوونییەکی باشیشی لە بارەی واقیعەوە هەبێ و، بزانێ ئەو کۆمەڵگاو خەڵکەی لە نێویان دایە چۆنن: لە ڕووی فیکریی و کۆمەڵایەتیی و کلتوورو نەریت و سیاسیی و ئابووریی و ... هتدەوە؟!

فەرمایشتی خواش:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ يوسف.



واتە: (ئەی محمد!) بڵێ: ئەوە کە لەبەر ڕۆشنایی و شارەزایی (بە دین و ژین)دا خۆم و شوێنکەوتووانم(خەڵك) بۆ لای خوا (و ئایین و بەرنامەکەی) بانگەواز بکەین، ئا ئەوە ڕێبازی منە، پاکییش بۆ خواو من لە هاوبەشدانەران نیم.

پێویستیشە بگوترێ: کە هۆکاری سەرەکیی هەڵەو پەڵەو خلیسکان و لادانەکانی زۆرێك لە مسوڵمانان بە گشتیی و، بە تایبەت لە بواری کارو چالاکیی و جم و جۆڵیاندا دووان بوون:

١- تێگەیشتنیان بۆ ئیسلام، ناتەواو و کرچ و کاڵ بووەو شتانێکیان لە: ئیجتیهادو مەزهەب و ڕێباز (طریقة)و قوتابخانە (مدرسة) و حیزب ... هتد بە ئیسلام داناون، کە ئیسلام نەبوون و، تێگەیشتن و ئەزموون و هەوڵی مسوڵمانان بوون لە دینداریيان دا.

٢- واقیع و هەل و مەرجەکەی خۆیانیان باش نەناسیوەو، سەرەنجام مامەڵەکەشیان لەگەڵیدا، هەڵەو ناتەواو بووە.

هەڵبەتە جاری واش بووە کەسێك، یان کەسانێك، یان کۆمەڵێك، هەردووك هۆکارەکەی تێدا کۆبوونەوەو، ئەو قوڕەی تێیکەوتوە هێندەی دیکە خەست بووە.

## بنەمای چوارەم

## ئیسلام، بەبێ نوێ کردنەوە (تجدید) ـ تازەکردنەوەی لێ تێگەیشتنی ـ لەژیان بەجێ دەمێنێ

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گرنگە، بۆ مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست، بەڵێ بە دڵنیایی ئیسلام ئەگەر لێ تێگەیشتنی تازە نەکرێتەوە، لەژیان بەجێ دەمێنێ، باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەو قسەیە، واقیعی ئێستای مسوڵمانانە، کە بەهۆی بەجێمانیان لە ئایینەکەیان و، ڕاست و دروست و هاوچەرخانە لێ تێنەگەیشتنیەوە، لەهەموو ڕوویەکەوە، لە ژیان دواکەوتوو پەککەوتوون!





ئنجا ئەگەر ئێمە بڵێین: مسوڵمانان باش لەئیسلام تێگەیشتوون و، چاکیش پێوەی پابەندن، حاڵیشیان ئەو حاڵەیە! مانای وایە ئیسلام خۆی ناتەواوە! ڕۆژێك مامۆستایەك (مەلایەك) سەردانی کردم، گوێی لە کەسێك بوو بوو مەدحی (داعش)ی کردبوو، کە ئەوکەسە پێشتر ئیسلامیی بووەو، ئێستا - وا دیارە- هەڵگەڕاوەتەوە، هەرچەندە ڕەنگە خۆی بەهەڵگەڕاوەش دانەنێ، بەڵام بێگومان کەسێك ڕقی لە ئیسلام بێ و بیبوغزێنێ، بە مسوڵمان دانانرێ، هەرچەندە پێشتریش مسوڵمان بووبێ.

ئنجا ئەو مامۆستایە هاتبوو گوتی: مامۆستا! فڵانکەس کە خەڵکێك زەمی دەکەن و دەڵێن: دژی ئیسلامە! لەسەر تەلەفزیۆن مەدحێکی زۆری داعشی کرد و، دیارە زۆر دڵسۆزی ئیسلام و مسوڵمانانە!

ئەوكاتیش سەرەتای پەیدابوونی (داعش) بوو و، جارێ خەڵك نەیناسیبوون، گوتم: چۆن! چی گوت؟ گوتی: دەیگوت: ئەوەی داعش دەیكەن، ئیسلام بۆخۆی ئاوایە و ڕێك ئیسلام جێبەجێ دەكەن! منیش گوتم: مامۆستا گیان! وای لێ حاڵی بووی كە ئەوە دڵسۆزی ئیسلام و مسوڵمانانە؟! گوتی: بەڵێ، گوتم: نا، ئەوە دەیەوێ بڵێ: داعش خراپ نیە، ئیسلام بۆخۆی خراپ و غەڵەتە، دەیەوێ بڵێ: خەڵكینە! ڕەخنە لە داعش مەگرن، بڵێن: داعش وایكردو وایكرد، ئیسلام هەر بۆخۆی وایە، یانی: ئەگەر داعش ڕەفز دەكەن، ئیسلامیشی پێوە ڕەفز بكەن!


٤٨


مەبەستم ئەوەیە: بۆ واقیعی ئێستای مسوڵمانان، یان دەبێ بڵێین: ئێمە لەئیسلام بەجێماوین، هەم لە ڕووی تێگەیشتنی، هەم لە ڕووی پێوە پابەند بوونیەوە، یان دەبێ بڵێین: ئیسلام بۆخۆی هەڵەیە! ئەگەرنا ئەوە حاڵ نیە مسوڵمانانی تێدان، كە لە هەموو ڕوویەكەوە پێویستییان بەغەیری خۆیانە، پەرتەوازەو پەككەوتەو بەجێماو، مسوڵمانان لێرە لێیان دەقەمەوێ، ناحەوێنەوە، دەچن لەوڵاتانی كافرستان، دەحەوێنەوە! وەختی خۆی مسوڵمانان وڵاتی مسوڵماننشینیان ناوناوە: (دار الإسلام و دار الأمان) و وڵاتانی كافرەستانیان ناوناوە: (دار الكفر و دار الخوف)، چونكە مسوڵمان ئەوكاتە لە وڵاتی خۆیدا حەواوەتەوە و ئەمین بووە لەخۆی، بەڵام ئێستا ئەو شوێنەی كە وەختی خۆی: (دار الكفر و دار الخوف) بووە، ئێستا لەوێ لەخۆی ئەمین دەبێ، چەند بانگەوازكار لەوێن؟ كە ئەگەر لەوڵاتی خۆی بێ، یان دەیگرن، یان دەیكوژن، مانای وایە مسوڵمانان بەمانای وشە، دواكەوتوون، هەم لە ڕووی چاك لێ



تێگەیشتنی قورئان و سوننەتەوە و، هەم لە ڕووی چاك پێوە پابەند بوونیانەوە، بۆیەش واقیعمان وەك ئێستایە و، بەو دەردە چووین!

بۆیەش پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) ڕایگەیاندوە کە هەر ماوە ماوە، خوا کەسانێك دەرەخسێنێ کە ئایین و بەرنامەی ئۆممەتەکەی تازە بکەنەوە، وەك دەفەرمویّ: {إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ، مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا} أخرجه البيهقي في المعرفة برقم (٤٢٢) عن أبي هريرة، وأخرجه أيضا: أبو داود برقم (٤٢٩١)، والطبراني في الأوسط برقم (٦٥٢٧)، والحاكم برقم (٨٥٩٢)، والخطيب (٦١/٢، ترجمة ٤٥٤)، والديلمي برقم (٥٣٢)، قال المناوي (٢٨٢/٢): قال الزين العراقي وغيره: سنده صحيح، وقال الألباني: صحيح.





واتە: خوا بۆ ئەم ئۆممەتە، لە سەری هەر سەدساڵێك، کەسانێك دەرەخسێنێ، کە ئایینەکەی بۆ تازە بکەنەوە.

کە مەرج نیە کەسێك بێ، یان کەسێکی دیارییکراو بێ، گرنگ ئەوەیە بەردەوام پرۆسەی تازە کردنەوەی ئیسلام هەیە لەنێو ئۆممەتدا، تازە کردنەوەی ئیسلامیش یانی: تازە کردنەوەی لێ تێگەیشتنی، کە چاك لێی تێبگەین و، دووبارە پێیەوە پابەند بینەوە.

## بنەمای پێنجەم

## بناغە لە بواری ئیمان و خواپەرستییدا: شوێنکەوتنی وەحییە، بەڵام لەبواری هەڵسوکەوتەکاندا، بناغە دەستکراوەیی و داهێنانە، مەگەر لەگەڵ وەحییدا دژ بوەستێ

بۆیە لە بواری ئیمان و خواپەرستییدا، بناغە بریتیە لە: شوێنکەوتنی (وەحیی) و، پابەند بوون بە شەریعەتەوە، چونکە مامەڵە لەگەڵ خوادا سبحانه و تعالی، بەس خوا دەزانێ دەبێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟ بەڵام لەبواری هەڵسوکەوتەکاندا، کە مامەڵەی بەینی خۆمانە، ئەوە لە مەودای عەقڵی مرۆڤدایە، بۆیە: بناغە تێیدا دەستکراوەیی و داهێنانە، مەگەر شتێك لەگەڵ دەقێکی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەریعەتدا دژ بوەستێ.

زانایان وەك بنچینەیەکی شەرعیی لەو بارەوە گوتوویانە: {الأصل في العبادات الحَظْر، إلاّ ما ورد عن الشارع تشريعه، والأصل في العادات الإباحة، إلاّ ما ورد عن الشارع تحريمه}[1].

واتە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا بریتیە لە: قەدەغە بوون، مەگەر ئەوەی کە لە شەرعدانەرەوە بە ڕەوا داندرابێ و، بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا، بریتیە لە ڕێپێدران، مەگەر ئەوەی کە لە شەرعدانەرەوە قەدەغە کرابێ. یانی: پێچەوانەی یەکدیین، جاری

-------------------------

(١) أصول الفقه المهمة، لعبدالرحمن بن ناصر السعدي، ص (١٠٥-١٠٦)، هەروەها هەمان مەبەست لە کتێبی: (القواعد النورانية الفقهية)ی (إبن تيمية)ش دا، هاتوە، ص (١١٢).



دیکەش باسمان کردوە کە ئەوە زۆر گرنگە براو خوشکانی بەڕێز! ئێمە لەبواری ئیمان و خواپەرستییەکاندا ڕێمان لێ گیراوە و بۆمان نیە هیچ جۆرە خواپەرستییەك بکەین، مەگەر شەریعەت دایبنابێ، بەڵام بە پێچەوانەوە: لە بواری عادەت و هەڵسوکەوتەکاندا واتە: حوکم و سیاسەت، ئابووریی، بواری ئیداریی، بواری جەنگ و ئاشتیی، پەیوەندییەکان، ژیانی ڕۆژانە.. هتد، هەموو ئەوانە ئەصڵ تێیاندا دەستکراوەیی و، ڕەواییە و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی فڵان شتە قەدەغەیە، ئەگەرنا هەمووی ڕەوایە، گرنگ ئەوەیە بەرژەوەندیی بهێنێتە دی و، خەڵك لە ئەنجامی ئەوەدا، تووشی قازانج و خێرو خۆشیی ببن.





## بنەمای شەشەم

## شـــەریعەت لە بـــواری چـــەسپاوەکان (الثوابت)دا چڕۆتە نێو وردەکارییەکانەوە، بەڵام لە بواری گۆڕاوەکان (المتغییرات)دا، بە کورتیی و گشتیی (إجمال) دواوە

هەمیشە شەریعەت لەبواری ئەو شتانەدا کە ناگۆڕێن و چەسپاون، وردەکارییەکان باس دەکات و خاڵ دەخاتە سەر پیت، بەڵام لە بواری شتە گۆڕاوەکاندا، بە کورتیی و بەگشتیی خوای پەروەردگار سبحانە و تعالی فەرمایشتی کردوە و، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) شتی فەرمووە[1].

ئنجا دەتوانین بڵێین: ئەوانە بوارەکانی نەگۆڕەکان و چەسپاوەکانن:

{١- بووناسیی،

٢- ئیمان و عەقیدە،

٣- خواپەرستییەکان،

٤- باری کەسێتیی،

٥- ڕەوشت و ئاکار،

٦- حەڵاڵ و حەرام بە گشتی}.

---

(١) لە بەشی دووەمی کتێبی پێنجەمی: (مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) بەناو و نیشانی: {شەریعەتی چەسپاو و ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!}، بە درێژیی لەوبارەوە دواوین.

لەم بوارانەدا شەریعەت خاڵی خستۆتە سەر پیت، هەروەها دەتوانین بڵێین، ئەوانەش بوارەکانی گۆڕاوەکانن:

{١- ئابووریی،

٢- جەنگ و ئاشتیی،

٣- حوکم و سیاسەت،

٤- ژیان و گوزەران،

٥- ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا،

٦- ئەدەب و هونەر}.







ئەوانەش هەموویان شەریعەت بە کورتیی و گشتیی لێیان دواوە و، بە دانانی چەند بازنەیەکی فراوان و چەند هێڵێکی گشتیی، وازی لێ هێناون.

با دوو نموونە بێنینەوە بۆ ڕوونکردنەوە:

**نموونەی یەکەم: لە بواری دەوڵەتدارییدا:**

لە بواری دەوڵەتدارییدا، شەریعەت تەنیا چەند بنەمایەکی داناون، بۆنموونە:

أ- دەبێ فەرمانبەریی بۆ خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و کاربەدەستانێك بکرێ، کە لە ئیمانداران:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾ (النساء:٥٩).

 

ب- دەبێ کاروباریان بەڕاوێژ بێ ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ (الشورى:٣٨).

ج- دەبێ ئەمانەتی حوکمڕانیی بە کەسانی شایستە بسپێردرێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

چەند بنەمایەکی کەممان هەن، لەو بوارەدا.

بۆیە (إمام الحرمين الجويني)[1] دەڵێ: {ولا مَطْمَعَ في وجدان نص من كتاب الله تعالى، في تفاصيل الإمامة، والخبر المتواتر مُعْوِزٌ أيضاً، فآل مآل الطلب في تصحيح المذهب إلى الإجماع}[2].

واتە: ئومێد نیە کە دەقێك لە کتێبی خوای بەرز بێنین لە وردەکارییەکانی حوکمڕانیی دا، هەروەها هەواڵی (متواتر)یش هەر کەمە، یان نیە (واتە: فەرمایشت) کەواتە: سەرەنجام دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئیجماع [واتە: داخۆ مسوڵمانان چۆنیان پێ چاکە، دەگەڕێینەوە بۆ عەقڵ و بەکارهێنانی عەقڵی خۆیان و ڕاوێژو کۆڕاو یەکدەنگیی].

54

---

((١)) (الجويني) پیاوێکی زۆر عەقڵ ئازاد بووەو لە ڕۆژگارێکیش دا ژیاوە کە زۆر پاڵی پێوە ناوە ئیجتیهاد بکات، وەك (إبن تيمية) لە زۆر مەسەلەدا ئیجتیهادی کردوە، چونکە لەو کاتەدا هەم دەوڵەتی عەبباسیی هەبووە، هەم دەوڵەتی ئومەویی لە ئەندەلوس هەبووە، بۆ وێنە: گوتوویەتی: لە شەرعدا جێی دەبێتەوە، مادام وڵاتی مسوڵمانان زۆر لێك دووربێ و، دەریایان کەوتبێتە بەینێ، ئاساییە دوو خەلیفە هەبن، پێم وایە یەکەم کەس بووە شتی وا بڵێ. هەروەها باسی: (شغور البِلاد من السلطان) دەکا، کە ئەگەر مسوڵمانان حوکمڕانیان نەما، دەبێ چی بکەن؟ دەڵێ: دەبێ مشوورخۆرانیان کار و بار بەڕێوە ببەن و...هتد.

((٢)) غياث الأمم، ص١٠٠.



**نموونەی دووەم: لەبواری خوا پەرستییدا:**

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەلای کەمەوە دووجار لەسەر مینبەری خۆی نوێژی کردوە لەپێش چاوی هاوەڵان و، فەرموویەتی: {وَصَلُّوا كما رَأَيْتُمُونِي أصلي} أخرجه أحمد برقم (١٥٦٣٦)، والبخاري برقم (٧٨٥)، ومسلم برقم (٦٧٤)، والنسائي برقم (٦٣٥)، وابن حبان برقم (١٦٥٨).

واتە: وەك منتان بینی نوێژم کرد، ئاوا نوێژ بکەن.

ئنجا بۆ حەج و عومرەش بەهەمان شێوە فەرموویەتی: {لِتَأْخُذُوا عَنِّي مناسِكَكُم} أخرجه مسلم برقم (١٢٩٧)، وابن خزيمة برقم (٢٨٧٧).





واتە: خوا پەرستییەکانی حەج و عومرەم لێوەربگرن.

بەڵام بۆ حوکم و سیاسەت و وڵات بەڕێوە بردن، بەپێی عورف و باوی سیاسیی ڕۆژگاری خۆی ئیستیفادەی کردوە کە ئەو وڵاتە، ئەو قەوارە سیاسییە، چۆن بەڕێوە بەرێ! نەك وەك نوێژەکە بفەرموێ: وەك چۆن نوێژ دەکەم، ئاوا بیکەن، نەهاتوە بفەرموێ: وەك چۆن دەوڵەت بەڕێوە دەبەم، ئێوەش ئاوا بەڕێوەی ببەن! چونکە زانیویەتی بابەتی دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی، مامەڵە کردنە لەگەڵ واقیعێکی گۆڕاودا، بۆیە پێویستی بە عەقڵێکی کراوە دەکات و، دەست و پێی مسوڵمانانی نەبەستوە.

تەماشا بکەن! پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی فەرموو، کەسی بۆ جێی خۆی دیاریی نەکرد، بەڵێ بە تەئکید کەسی دیاریی نەکرد،ڕاستە فەرمووی: با ئەبووبەکر نوێژ بە خەڵکی بکات، بەڵام نەیفەرموو: با خەلیفە بێ، لەدوای من! بۆیەش دوایی کە پێغەمبەر



(صلی الله علیه وسلم) وەفات دەکات، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، دەکەونە مشت و مڕو ڕاجیاییەوە، کە ئەسڵەن جارێ لەکوێی بنێژن؟! هەتا فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، لەکوێ وەفاتیان کرد، دەبێ لەوێ بنێژرێن، ئیدی لە ژوورەکەی دایکمان عائشەدا خوا لێی ڕازی بێ، دەنێژرێ.

ئنجا ڕاوێژ و مشت و مڕدەکەن، چۆن ئەو بۆشاییەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەجێی هێشتوە، پڕی بکەنەوە؟ ئنجا ئەگەر دەقێك هەبووایە وەك شیعە دەڵێن، یەکسەر دەیانگوت: فلانکەس، جێگرەوەیەتی، بەڵام مشت و مڕیان بۆیە بووە و، بۆیە خراوەتەوە ڕاوێژەوە، چونکە دەق (نص) نەبووە، ئەگەرنا: {لا اجتهاد في معرض النص} لە بەرانبەر دەق دا ئیجتیهاد نیە.

مەبەستم ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حوکمڕانیی و وڵات ئیدارەدانی، بۆ عەقڵی خۆیان بەجێی هێشتوە، چونکە زانیویەتی کە ئەو دنیا گۆڕاوە، پێویستیی بە عەقڵێکی ئازادو کراوە دەکا، بەڵام بۆ نوێژو حەج و عومرە و عیبادەت بەگشتیی، بەوردیی بۆی دیاریی کردوون، چونکە زانیویەتی ئەوبوارە گۆڕانی بەسەردا نایەت و، پەیوەندیی بە جەوهەری مرۆڤەوە و بەخواوە و، بە دیوی پەنهان (غیب)ەوە هەیە و، گۆڕانی بەسەردا نایەت،، بۆیەش زانایان ئەم بنچینەیان داناوە کەدەڵێ: {إجمالٌ في المتغييرات و تفصيلٌ في الثوابت} واتە: بە کورتیی قسە کردن لە بارەی گۆڕاوەکانەوە و، بەدرێژیی قسە کردن لەباری نەگۆڕەکانەوە.

## بنەمای حەوتەم

**وەك چۆن ئەسڵ لە شتاندا، پاکییە و، لە هەڵسوکەوتاندا، ڕەواییە و، لە کەسەکاندا، ئەستۆ پاکییە، بەهەمان شێوەش: ئەسڵ لە مسوڵمانانیشدا، مسوڵمانەتییە، هەتا پێچەوانەکەی بەبەڵگەیەکی دڵنیاکەر دەچەسپێ:**

پێم وایە هەمووتان ئەوەتان بیستوە کە زانایان دەڵێن: {الأصل في الأشياء: الطهارة، والأصل في العادات: الإباحة، والأصل في الأشخاص: براءة الذمّة}، ئەوانە هەموویان بنچینەی شەرعیین:







١- بناغە لە شتەکاندا: پاکییە و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی ئەو شتە پیسە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا هەموو شتەکان، پاکن، دیارە ئەو شتانەی کە لە خودی خۆیاندا پاکن، بەڵام گۆشتی بەراز، هەروەها ئەو شتەی شەرع بە پیسی دانابێ، پیسە و ئەوە جیایە

٢- ئەسڵ لە هەڵسوکەوتەکاندا: ڕێپێدرانە و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ڕێ لێگیران.

٣- ئەسڵ لە شەخسەکاندا: بریتیە لە ئەستۆ پاکیی و، بێ گوناهیی و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر تاوانباریی.

ئنجا بەهەمان شێوە: ئەسڵیش لە مسوڵماناندا، ئەوەیە کە هەر کەسێك گوتی: مسوڵمانم، دەبێ بڵێین: مسوڵمانە و، دەبێ مامەڵەی مسوڵمانانەی لەگەڵدا بکرێ، هەتا بەڵگەیەکی ڕوون و بێ چەندو چوونی پێچەوانەی ئەوە دەبێ و، دەیسەلمێنێ کە ئەو کەسە

ب/ هەست و نەست و خولیایەکان (المشاعر).

ج/ ڕەوشت و ئاکارەکان (السلوکیات).

سێیەم: لێرەدا خوا باسی کۆمەڵگا و خەڵك دەکات. کەواتە: دەبێ بزانین، ئەگەر کۆمەڵگاو خەڵك بە گشتی خۆیان نەگۆڕن: بیرەکانی نێو عەقڵ و، خولیایەکانی نێو دڵ و، ڕەوشت و ڕەفتارەکانیان، ناگونجێ لە سۆنگەی ئەوەوە کە چەند تاکێك خۆیان گۆڕیوە، واقیع و حاڵی خەڵك و کۆمەڵگایەکە بە گشتی بگۆڕێ!

بەڵێ هەر تاکێك دەروونی خۆی گۆڕی، حاڵ و واقیعی دەگۆڕێ، بەڵام بە نسبەت کۆمەڵگاوە: دەبێ بە گشتی خۆیان بگۆڕن بۆیەش گوتراوە: (بە گوڵێك بەهار نایەت)، هەروەها گوتراوە: (تاکە سوار تۆزێ ناکات).







## ڕێڕۆشنکەرەوەی چوارەم

**هەڵوێستی ڕاست و دروست لە بواری گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگادا، موداراکردن و خۆڕاگریی و سوربوونە لەسەر چاکسازیی تێدا کردنی و بەرەو بەختەوەریی و سەرفرازیی بردنی:**

پێشتریش چەند جارێك ئەم بابەتەمان باسکردوە، کە مسوڵمانان بۆ مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگایەکانیان دا، تەنیا چوار ئەگەریان لەبەردەم دان:

١- سەری خۆهەڵگرتن و لێ ڕاکردنی، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت کردیان.

٢- خۆپێدادان و بەگژداچوونەوەی بەهێز.

٣- لێ بێدەنگ بوونی، یان بۆ ملکەچ بوونی و، سەری خۆکزکردن و بوون بە بەشێکی.

٤- ساچاندن و موداراو خۆڕاگریی لەسەر ئازارو ناڕەحەتییەکان و، سور بوون لەسەر پاکسازیی و چاکسازیی کۆمەڵگاو بەرەو خوا بردن.

بە سەرنجدانی ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەتیش، هەروەها بەسەرهاتی پێغەمبەران بە گشتی و بە تایبەت خاتەم و سەروەرمان موحەممەد (علیه وعلیهم الصلاوة والسلام) وەك ڕۆژی ڕوون دیارە، کە تەنیا ئەگەرو ڕێی چوارەم ڕاست و ڕەوایەو، ئەوانی دیکە هەرکامیان وێڕای زیانی گەورە گەورە، ئیشکالی شەرعیی و عەقڵیی گەورەشیان تێدایە.



ئنجا لەبەر ئەوەی لە کتێبی سێیەم: (چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگاو، پاکسازیی و چاکسازیی تێدا کردنی)دا، بە درێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە، لێرە زیاتری لێ نادوێین.









## ڕێڕۆشنكەرەوەی پێنجەم

### جێبەجێكردنی زۆربەی شەریعەت، بە تاك و كۆمەڵگاوە پەیوەستەو، جێبەجێكردنی كەمێكی بە دەوڵەتەوە پەیوەستە:

زانینی ئەم ڕاستییەی سەرەوە، كە بۆ هەر كەسێك شارەزایی قووڵی بە شەریعەت هەبێ، شتێكی ڕوونە، خوازیاری ئەوەیە كە ئێمەی مسوڵمانانی عەوداڵی سایەو سێبەری شەریعەت، چاوێكی جیددیی بە خۆمان دا بگێڕینەوە، چاوەڕێی حوكمڕان و دەوڵەت نەبین: شەریعەتی خوای كارزان و میهرەبانمان بەسەردا جێبەجێ بكات، چونكە زۆربەی هەرە زۆری یاساكانی شەریعەت - شەریعەت بە ماناو چەمكە فراوان و گشتگیرەكەی، نەك بە چەمك و واتا عورفییەكەی كە زۆر بەرتەسكە - پەكیان لەسەر دەستەڵات و (سلطة) و دەوڵەت نەكەوتوە، بە تاكەكان و كۆمەڵگا (الأفراد والمجتمع)ەوە پەیوەستن و، دەتوانم بڵێم: ئەو جۆرە حوكمانەی شەریعەت زیاتر لە سەدا نەوەد (٩٠٪)ی كۆی حوكمەكاننی و، ئەوانەی پەكیان لەسەر دەستەڵات كەوتوە دەوری لە سەدا دە (١٠٪)یان كەمتریشن، وەك چەسپاندنی دادگەریی و، لابردن و ڕێ لێگرتنی ستەم و دەستدرێژیی و، جێبەجێكردنی سزاو سنووره شەرعییەكان (العقوبات والحدود الشرعية).

هەڵبەتە لە كاتێكیشدا كە مسوڵمانان لەو بوارانەدا كە بۆیان دەكرێ بە شەریعەت و یاساو ڕێنمایی و ئەدەبەكانیەوە پابەند دەبن وەك تاكەكان و كۆیان، ئەمە وێڕای ئەوەی كە لە پانتاییەكی گەورەو فراوانی دینداریی و مسوڵمانیەتی دا، ئیسلام جێبەجێ دەكەن، هاوكات

بەم کارەیان زەمینەی جێبەجێکردنی بەشەکانی دیکەی شەریعەتیش خۆش دەکەن، خوای بەبەزەیی و بەخشندەش زیاد لە توانای لە هیچ کەس داوا ناکات، وەك فەرموویەتی:

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة.

## ڕێڕۆشنكەرەوەی شەشەم

## قەوارەی سیاسیی لە ئیسلام دا، لە هەناوی كۆمەڵگا دێتەدەرێ

بەڵێ كۆمەڵگای مسوڵمان كە بڕیار دەدات قەوارەی سیاسیی ڕابگەیەنێ، تاكو دوای ئەوەی وەك تاكەكان هەر كامیان لە خودی خۆیداو، وەك كۆمەڵگاش هەرچی پێیان كراوە لە ئیسلام و مسوڵمانەتیی جێبەجێیان كردوەو، پێوەی پابەند بوونە، ئەمجارە ئەوەی لە یاساكانی ماوەو، بە دەستەڵات و قەوارەی سیاسیی نەبێ جێبەجێ ناكرێ، بتوانن بە هۆی دەستەڵاتی سیاسییەوە جێبەجێی بكەن.

دەرككردنی ئەم ڕاستییەش زۆر گرنگە، چونكە بە داخەوە كەسانێكی زۆر كە لە مەیدانی كارو جموجۆڵی ئیسلامیی دا بوونیان هەیە، وا گومان دەبەن، كە دەبێ بە زەبری هێزو دەستەڵات، پابەندیی بە شەریعەتەوە (الإلتزام بالشريعة) بەسەر خەڵك و كۆمەڵگادا بسەپێنرێ!

بەڵام بە دڵنیایی ئەوە ڕاست نیە، بەلای كەمەوە لەبەر سێ هۆكاری گرنگ:

یەكەم: ئیسلام بە زۆر بەسەر خەڵك و كۆمەڵگادا سەپاندن، ناچاری نیفاق و دوو ڕوویيان دەكات و نیفاقیش - كە كوفری پەنهانە - لە كوفری ئاشكرا خراپترە بۆ دنیاو قیامەت، بۆیە ئەگەر بگونجێ هەر فیكرەو بەرنامەیەك بە زۆر بسەپێنرێ، ناگونجێ ئیسلام بە زۆر بەسەر خەڵكدا بسەپێنرێ، چونكە ئیسلام بەر لە هەرشتێك سەرو

كاری لەگەڵ ناخ و دڵ و دەروونی مرۆڤ دایەو، ئیسلامێك لەوێوە سەرچاوە نەگرێ، خاوەنەكەی نەك هەر لێی بەهرەمەند نابێ، بەڵكو لەسەریشی قەرزدار دەبێتەوە و سزا باریش دەبێت.

دووەم: قەوارەی سیاسیی ئیسلام، لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئیسلام ڕێی نادات مل بۆ كوفر و ستەمی جیهانیی نەوی بكات، هیچ بەدیلی نیە بۆ باوەشی پڕ سۆزو گەرمی خەڵك و جەماوەر، هەڵبەتە كۆمەڵگایەكیش بەزۆر ئیسلامی بەسەردا بسەپێنرێ، هەر دەرفەتی لێ هەڵبكەوێ: لێی هەڵدەگەڕێتەوەو ڕەفزی دەكات.

سێیەم: هەر فیكرەو بەرنامەیەك بە زەبری هێز بسەپێنرێ، بە زەبری هێزیش لادەبرێ و، نیزیكترین نموونەش لەو بارەوە: (عمر حسن البشیر)ە، كە سی (٣٠) ساڵ لەمەوبەر بە كودەتا (إنقلاب)یەكی سەربازیی هاتە سەر حوكم و، لەم ڕۆژانەشدا هەر بە كودەتای سەربازیی لەسەر كار لادرا!

پێشم وایە دەرككردنی ئەو ڕاستییەو لەبەرچاوگرتنی، گەلێك هەڵەی كوشندەی ئەو بوارە، كە لە ڕابردوودا زەرەی زۆری بە مسوڵمانان و سومعەی ئیسلامیش گەیاندوە، چارەسەر دەكات و ڕێ لە دووبارە بوونەوەی دەگرێ.

## ڕێڕۆشنکەرەوەی حەوتەم

**بەهرەمەندبوونی مسوڵمانان لە غەیری خۆیان لە بوارەکانی: حوکم و سیاسەت و ئیدارەو ئابووریی و تەکنۆلۆژیاو ... هتددا، مادام لەگەڵ دەقێکی وەحیی دا دژنەوەستێ، نەك هەر دروستە، بگرە فەرز، یان پەسندە، بە پێی پلەی پێویستیی پێبوونەکەی:**

ئەمیش لەو بابەتە ڕۆشنانەیە کە زگماك و عەقڵ دەرکی دەکەن و، حەوجێی بە بەڵگەی نەقڵیی ناکات، بەڵام وێڕای بەڵگەی عەقڵ و فیطرەت، ئەم فەرمایشتە موبارەکەی خواش بەڵگەیەکی بەهێزە لەو بارەوە:

﴿...فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾﴾ الزمر. ١١٤

واتە: موژدە بەو بەندانەم بدە، کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك هەڵدەخەن، ئنجا دەکەونە شوێن چاکترینی، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا خستوونیە سەر ڕاستەڕێ و، ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

چونکە وشەی (القول) ئەلیف و لامی ناساندن (أل التعریف)ی لەسەرەو بۆ (جنس)ە و هەموو جۆرە قسەیەك دەگرێتەوە، بێژەر (قائل)ەکەی هەر کەسێك بێ.

ئنجا ئەگەر سەرنجی سیرەو ژیانی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بدەین، دەبینین هەر وای کردوەو لەهەر بیروڕاو پێشنیارو داهێنانێکی کە سوودی تێدا دیبێ، بەهرەی لێوەرگرتوە لە هەر کەسێکەوە بووبێ، بۆ وێنە:

١- بیرۆكەی هەڵكەندنی خەندەكی لە جەنگ (الأحزاب)دا لە (سلمان الفارسي) وەرگرتوەو جێبەجێشی كردوە[1].

٢- هەركام لە (منجنیق) و (دبابة)ی لە گرتنی هەندێك قەڵایاندا بەكارهێناون، كە پێشتر لە دوورگەی عەرەبیی دا، یان هەر بەكارنەهێنراون، یان زۆر بە دەگمەنیی بەكارهێنراون[2].

٣- كاتێك ویستی نامە بۆ پادشاكانی فارس و ڕۆم و دەوڵەتەكانی دیكە بنووسیّ و، هەواڵیان دایە كە پادشایەكان نامەی مۆرنەكراو (غیر مختوم) ناخوێننەوە، فەرمانی كرد مۆرێكیان بۆ دروستكرد، لێی نوسرابوو: (محمد رسول الله)[3]، ئنجا هەر نامەیەكی بۆ سەرۆكی وڵاتان ناردبایە بەو خەتمە مۆری دەكرد.



هەروەها چوار جێنیشینە سەر ڕاستە هیدایەتدراوەكانیشی: (أبو بكر، عمر، عثمان، علي)یش خوا لێیان ڕازی بیّ هەروایان كردوە، بە تایبەت (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بیّ، كە لە ڕۆژگاری ویدا دەوڵەتی ئیسلامیی زۆر فراوان بوو و گەشەی كردو، پێویست بوو لە ڕووی ئیداریی و حوكمڕانییەوە، داهێنان (إبداع)ی تازە بكریّ و، سوودو بەهرە لە ئەزموون و شارەزایی وڵاتانی دیكە وەربگیریّ، ئیدی ئەوە بوو لە ڕۆژگاری ویدا كۆمەڵێك شتی تازە داهێنران وەك:

یەك: دروستكردن و بنیاتنانی شاران (تمصيرُ الأمصار).

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام: ج٣، ص ١٠٩.

(٢) السيرة النبوية لابن هشام: ج٣، ص ٢٧٤.

(٣) صحيح البخاري: ٣١٠٦.

**دوو:** دانانی دیوانەکان (تدوین الدواوین) وەك: دیوانی سەربازان، دیوانی خەراج، دیوانی زەکات.

**سێ:** دانانی حەپسخانە.

**چوار:** دانانی پۆستە (برید).

هیچ گومانیش تێدانیە، بەبێ بەکارهێنانی شێوازو ئامرازە تازەو هاوچەرخەکان، مسوڵمانان لە ڕۆژگارو دنیای خۆیان بەجێ دەمێنن و، وەك کەسێك دێنە بەرچاو کە لە غەیری ڕۆژگارو واقیعی خۆیدا بژی!

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، کە زیاتر لە بەرنامەکەی حاڵی بین و، یارمەتییشمان بدات کە باشتر پێیەوە پابەند بین، لە ژیانی تاکییمان و، خێزانییمان و کۆمەڵایەتییمانداو، هەوڵبدەین ئەو دەوروبەرو کۆمەڵگایەی خۆمان، بەو شێوەیە لێ بکەین، کە جێگای ڕەزامەندیی و پەسندیی خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بێ و، خۆمان و کۆمەڵگاکەشمان بەختەوەری دنیاو سەرفرازی ڕۆژی دوایی بین.

خوێنەری بەڕێز!

لەڕاستیی دا لێکۆڵینەوە دەربارەی کەسایەتیی ئینسانی مسوڵمان مەودایەکی بەرفراوان و شوێنێکی تەرخانکراوی پێویستە و، کورد گوتەنی: (هەویرێکی ئاوخوازە) بۆیە لێرەدا دوای ئەوەی لەبەرتیشکی چەند ئایەتێکی قورئان دا، خەسڵەتە سەرەکییەکانی مرۆڤی مسوڵمان دەخەینەڕوو، زەقترین و گەورەترین دروشم و نیشانەی کەسایەتیی ئینسانی مسوڵمان، کە بریتیە لە هاوسەنگیی (توازن) لە چەند بوارێك دا دەخەینەڕوو:

خوای زانا و مەزن فەرموویەتی:

﴿ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ ﴾ الرعد: ١٩ - ٢٢.

واتە: ئایا ئەو کەسەی کە دەزانێ: ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆلای تۆ دابەزێنراوە، ڕاستە، وەك ئەو کەسە وایە کە کوێرە؟ بێگومان بەس خاوەن عەقڵان بێدار دەبنەوە. ئەوانەی کە پەیمانی خوا دەبەنەسەرێ و، بەڵێن هەڵناوەشێننەوە و، ئەوانەی کە هەرچی- پەیوەندییەك- خوا فەرمانی کردوە بە گەیاندنی، دەیگەیەنن و، لە پەروەردگاریان دەترسن و، لە لێپرسینەوەی (توندوتیژو) خراپ دەترسن. هەروەها ئەوانەی کە لەپێناوی ڕەزامەندیی خوادا، خۆڕادەگرن و، نوێژێ بەرپا دەکەن و، لەو ڕۆزییەی داومانێ، بە پەنهانیی و بە



ئاشکرا دەبەخشن و، بە چاکە خراپە لادەبەن، ئەوانە سەرەنجامی- چاکی- دوارِۆژیان هەیە.

وەك دەبینین: لەم چوار ئایەتە بەپێزەدا، خوای شارەزا و وردبین، نۆ (٩) خەسڵەتی سەرەکیی لە خەسڵەتەکانی مرۆڤی مسوڵمانی خستوونەتەڕوو:

**١- زانیاریی و شارەزایی (أفمن یعلم):**

یەکەمین خەسڵەتی مرۆڤی مسوڵمان، ئەوەیە کە لە ئایین و بەرنامەی خوادا، شارەزا و ئاگادار و چاوساغە، وەك لە جێیەکی دیکەدا فەرموویەتی:

﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ...﴿١٠٨﴾﴾ یوسف: ١٠٨.

واتە: بڵێ: ئەمەیە ڕێبازی من، لەبەر ڕۆشنایی دا، بانگەوازی بۆ لای خوا دەکەم..



**٢- پەیمان بردنەسەر (الذین یوفون بعهد الله):**

هەموو ئینسانێك بەڵێن و پەیمانی بەندایەتیی کردن بۆ خوای لە ئەستۆدایە[1]، ئنجا بابای مسوڵمان، ئەو بەڵێن و پەیمانە دەباتەسەرێ و نایشکێنێ، کەواتە: مسوڵمان بابایەکی (خوا پەرستە).

---

(١) چونکە خوا هەموو ئینسانێکی وا سروشتاندوە کە دڵ و دەروونی تینوو و عەودالی خوا بێ، ئنجا ئەو شێوە سروشتاندنە، پەیمان و بەڵێنێکی سروشتییە و کە لەهەموو ئینسانێك وەرگیراوە، خوا لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ...﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف: ١٧٢.

ئەم لێکدانەوەیەش کە یەکێکە لە ماناکانی ئەم ئایەتە، بەلای منەوە لەهەموو مانایەکانی دیکەی بەهێزترە و لەگەڵ عەقڵ و شەرعیش دا گونجاوترە.

**٣- گەیاندنی پەیوەندییەکان** ﴿وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَن يُوصَلَ ....﴿٢١﴾﴾ :

خەسڵەتێکی دیکەی مرۆڤی مسوڵمان، کە ئەنجامی سروشتیی و مسۆگەری، دوو خەسڵەتی پێشوویە، ئەوەیە کە هەموو پەیوەندییانەی خوای کارزان فەرمانی پێ کردوون، دەیانگەیەنێ، وەك پەیوەندیی لەگەڵ دایك و باب، لەگەڵ ماڵ و خێزان، لەگەڵ خزمان، لەگەڵ دراوسێ، لەگەڵ دۆست و برادەر...هتد، هەموو ئەو پەیوەندییانە لەسەر بنچینەی چاکەکردن (الإحسان) دەگەیەنێ و، ناهێڵێ بەهۆی گوێ پێ نەدانەوە، بپچڕێن و بێ وەفا دەربچێ!

کەواتە مسوڵمان بابایەکی (خەڵك دۆستە).

١٢١

**٤- سام و هەیبەت سەبارەت بە خوا** ﴿وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ....﴿٢١﴾﴾ :

خەسڵەتێکی بنەڕەتیی دیکەی مرۆڤی مسوڵمان، بریتیە لە: (لەخواترسان) لەخواترسانیش وەك لە شوێنەوارێك هاتوە (ابن مسعود) دەڵێ: (چڵە پۆپەی زانیارییە). (رأس الحكمه خشية الله) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان ٧٤٤.

بەڵێ ئەنجامی مسۆگەر و چاوەڕوانکراوی، زانیاری ڕاست (العلم الصحيح) پەیبردنە بە گەورەیی و مەزنی خوا و، هەر کەسێکیش وەك پێویست خوا بناسێ، حەتمەن سام و هەیبەت و شەرم و ڕێز و خۆشەویستی سەبارەت بە خوا، دڵی پڕدەکات، خواش فەرموویەتی:
﴿...إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ....﴿٢٨﴾﴾ فاطر: ٢٨.



**٥- ترسان لە لێپرسینەوەی سەخت:** ﴿...وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾﴾:

یەکی دیکە لە خەسڵەتەکانی بابای مسوڵمان، هەست کردنیەتی بە مەترسیی، سەبارەت بە لێپرسینەوەی سەختی ڕۆژی دوایی، چونکە هەر کەسێك بە چاکیی خوا بناسێ، دەزانێ هەرچەندە خواپەرست و وەفادار و چاکەکار بێ، خواپەرستیی و وەفاداریی و چاکەکارییەکەی بایی ئەوەندە هەر نابێ، لەخوا بوەشێتەوە و، لەئەنجامی ئەوەش دا، ترس و سامی ڕۆژی لێپرسینەوەی هەر دەبێ.

**٦- خـــۆڕاگریی:** ﴿وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ...﴿٢٢﴾﴾ :

خۆڕاگریی (صبر) خەسڵەتێکی دیکەی بنچینەییە لە مرۆڤی مسوڵمان دا، (صبر)یش وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (حبس النفس على ما يقتضيه العقل والشرع)[1] حەپسکردنی نەفسە لەهەر شتێك کە عەقڵ و شەرع داخوازی بکەن، هەروەها (عبدالقادر)ی گەیلانیی خوا لێی خۆش بێ گوتوویەتی: خۆڕاگریی (صبر) سێ بەشە:

أ- خۆڕاگریی لەسەر فەرمانبەریی خوا.

ب- خۆڕاگریی لەسەر تاوان نەکردن.

جـ- خۆڕاگریی لەسەر بەلا[2].

---

(١) (مفردات ألفاظ القرآن) ص٢٧٣.

(٢) ئەو قسەیەی (عبدالقادر)ی گەیلانیی خوا لێی خۆش بێ، لە زۆربەی نووسراوەکانی دا دووبارەی کردۆتەوە، بەتایبەتی کتێبی: (الفتح الرباني) و کتێبی (فتوح الغيب) دا.

**٧- نوێژ بەرپاکردن:** ﴿...وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ...﴿٢٢﴾﴾:

نوێژ بەرپاکردن بەرهەم و ئەنجامی سروشتیی، ئەو خەسڵەتانەی پێشەوەیە، هەر بۆیەش لەپلەی حەوتەم دا گوتراوە، تاکو بزانین کە مسوڵمان بە نوێژی ڕووت و تەنیا، نابێتە مسوڵمان، هەروەها تاکو بزانرێ: کە نوێژ بەرپاکردن[1] - نەك نوێژ لەکۆڵ خۆ کردنەوە- بەس لە کەسێك چاوەڕێ دەکرێ، کە ئەو خەسڵەت و مەرجانەی پێشەوەی تێدابن.

**٨- ماڵ بەخشین:** ﴿...وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ...﴿٢٢﴾﴾:

بەخشینی ماڵ و سامانیش، کە ئەنجام و بەرهەمی خەسڵەتەکانی پێش خۆیەتی، یەکێکە لە سیفەتە بەرزە سەرەکییەکانی مرۆڤی مسوڵمان، چونکە ئەو نەك هەر ماڵ و سامانی، تەنانەت گیانیشی بە هی خوا دەزانێ و بەوی فرۆشتوە:

١٢٣

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ ...﴿١١١﴾﴾ التوبە: ١١١.

واتە: بێگومان خوا ماڵ و گیانی لە بڕواداران کڕیوە، کە بەهەشتیان بداتێ...

**٩- لابردنی خراپە بە چاکە:** ﴿ ...وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ...﴿٢٢﴾﴾:

ئەمە خەسڵەتی نۆیەمە، کە کۆتایی خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی مرۆڤی مسوڵمانە، لە دوو توێی چوار ئایەتی ڕابردوودا، کە ئەمە لە

---

(١) نوێژ بەرپاکردن (إقامة الصلاة) یانی بەجێهێنانی نوێژ، وەك خوا فەرزی کردوە، هەم ڕواڵەتی و هەم نێوەڕۆك و کاکڵی تەواو بێ.

زۆربەیان بە زەحمەتتر و قورسترە، هەر بۆیەش خراوەتە دوای هەموان، تاکو بزانین کە تەنیا کاتێك دەتوانین ئەو خەسڵەتە بەرزە لە خۆمان دا بهێنینەدی، کە خەسڵەتەکانی پێشوومان تێدابن، بەڵێ لە ڕاستیی دا، پاڵ پێوەنانی خراپە بە چاکە و، لەبەرامبەر خراپەدا چاکەکردن، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾﴾ فصلت: ٣٥.

ئەم خەسڵەتە- جگە لەوانەی خۆڕاگرن و، بە خاوەن پشك و بەشێکی مەزن نەبێ، نابەخشرێ.

بەڵام نابێ لەوە بێ ئاگابین کە ئەم یاسایە (یاسای چاکەکردن لە بەرانبەر خراپەدا)، بەس لەنێو مسوڵمانان دا و، لەگەڵ مسوڵمانانێکی تەبا و گونجاودا ڕەفتاری پێ دەکرێ و، لەگەڵ دوژمنان دا:

﴿..فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ...﴿١٩٤﴾﴾

واتە: هەرکەس دەستدرێژیی کردنە سەر وەك دەستدرێژییەکەی دەستدرێژیی بکەنەوەسەر... ڕەفتاری پێدەکرێ.

کەواتە:

خەسڵەت و سیفەتە سەرەکیی و بنەڕەتییەکانی مرۆڤی مسوڵمان، ئەمانەن:

١- شارەزایی لە بەرنامەی خوادا.

٢- وەفاداریی بەپەیمان.

٣- چاکەکاریی و خزم دۆستیی.



٤- سام و هەیبەت لە دڵدا بوون بەرانبەر بە خوا.

٥- ترسان لە لێپرسینەوەی سەخت و دژواری ڕۆژی دوایی.

٦- خۆڕاگریی و پشوودرێژیی و بارقووڵیی.

٧- نوێژ بەرپاکردن.

٨- ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا.

٩- لابردنی خراپە بە چاکە.

ئێستاش دەچینە سەر خستنەڕووی زەقترین و گەورەترین دروشم و نیشانەی کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمان، کە (هاوسەنگیی)یە، ئەویش لە چوار بواری سەرەکیی دا:





## زەقترین نیشانەی
## کەسایەتیی مسوڵمان هاوسەنگیی یە

جۆری کەسایەتیی (شخصیة)ی هەموو ئینسانێك، بەگوێرەی ئەو بوونناسیی و تێڕوانین و بیروبڕوایەیە، کە لە دڵ و مێشکی دا جێگیربووە و، لەبەر تیشکی دا بەڕێوە دەچیّ.

بەڵیّ ئینسان چۆن بیریکاتەوە، بەزۆریی ئاوا دەژی و، جۆری بوونناسیی و تێڕوانین و بیرکردنەوەی مرۆڤە، کە شێوە و چۆنیەتیی کەسایەتیی و، هەڵس و کەوت و، ڕەوشت و خوو و ڕەفتار و ئاکار و، جموجۆڵ و چالاکییەکانی دیاریی دەکات.

بۆ وێنە: بابایەکی ماددیی کە هەموو شتێك لە دەلاقەی ماددەو دیاردە و ڕواڵەتە بەرهەستەکانیەوە دەبینی و، هەموو شتێك هەر بە گەز و جاوی (ماددە) دەپێویّ، دەبینی هەموو ئامانج و مەبەست و خولیا و ئاواتەکانی لە جوغزی تەسکی ماددە و جیهانی بەرهەست، ناچنە دەریّ و، بەرزترین ئاوات و ئامانجی تێرکردنی گەدە و داپۆشینی جەستە و جووتبوون (جماع)ە و هیچی دی!!

بەڵیّ بوونناسیی و تێڕوانین و بیروبۆچوونی مرۆڤ، چۆن بیّ، هەمان جۆرە (کەسایەتیی)یش لەو مرۆڤە دەرەخسیّ، ئنجا تەواو بیّ تەواوو، ناتەواویش بیّ ناتەواوو.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیسلام بوونناسیی و بیروبڕوا (عقیدة) و بەرنامە (شریعة)یەکی ڕێك و پێك و هاوسەنگ و ڕاستە و، وەك



تەرازووێك وایە کە ڕاست ڕادەوەستێ و، بە شتاق لایان دا سەرناکات، ئەو ڕێك و پێکیی و هاوسەنگیی و ڕاست ڕاوەستان و سەرنەکردنە، لە مرۆڤی مسوڵمانیش دا، ڕەنگ دەداتەوە و، مرۆڤی مسوڵمان لە سۆنگەی ئەوەوە، کە شوێن کەوتووی بووناسیی و بیروبڕوا بەرنامەیەکی ڕاست و هاوسەنگیشە، کەسایەتییەکی دەبێ، کە لە بووناسیی و بیروبڕوا و بەرنامەکەی دەوەشێتەوە و، لەگەڵی دا پێکەڵپێك و جووتە.

ئنجا بێگومان هەروەك چۆن هاوسەنگیی ئیسلام، بەس لە لایەنێك و دوون دا نیە و، ئیسلام لە هەر ڕوویەکەوە و، لە هەر لایەنێکەوە، سەرنجی بدەی، دیاردەی هاوسەنگیی وەك ڕۆژی ڕوون، پێوە دیارە، مرۆڤی مسوڵمانیش بە هەمان پێ و دان، خاوەنی کەسایەتییەکی ڕێك و پێك و هاوسەنگە، لە هەموو ڕوویەکەوە و لە هەر بوارێکی ژیانی دا.





بەڵام لەبەر ئەوەی هاوسەنگیی کەسایەتیی ئینسانی مسوڵمان، بابەتێکە لق و پۆپی زۆرن، ئەو لایەنانەش کە هاوسەنگیی کەسایەتیی ئینسانی مسوڵمانیان تێدا دەردەکەوێ، یەکجار زۆرن و، ئێمەش لێرەدا مەودا و دەرفەتی خستنەڕووی هەموو ئەو لایەنانەمان نیە، بۆیە خوا پشتیوان بێ، چەند لایەنێکی گرنگ و سەرەکیی هەڵدەبژێرین، بۆ تێدا خستنەڕووی ئەو هاوسەنگیی و ڕێك و ڕاستییەی کە کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمانی پێوە دەناسرێ و، زەقترین و بنەڕەتیی ترین دروشم و نیشانە و ئیمتیازیەتی.

ئێمە بۆ ئاسانکردنی توێژینەوە و ڕوونکردنەوەی هاوسەنگیی لە کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمان دا، لە چوار بواران دا و، لە چوار



ڕووانەوە، لێی دەدوێین و، لە هەر بوارەش دا، چەند نموونەیەك دێنینەوە، ئەو چوار بوارەش ئەمانەن:

١- لە بواری بووناسیی و تێڕوانین دا.

٢- لە بواری بیروبڕوادا.

٣- لە بواری ڕەوشت و خوودا.

٤- لە بواری جم و جۆڵ و چالاکیی دا.




١٢٨


# بواری یەکەم

## هاوسەنگیی کەسایەتیی مسوڵمان، لە بواری بوونناسیی و تێڕوانین دا



### ١- سروشت و ئەودیو سروشت:

یەکەمین مەسەلە کە هاوسەنگیی و ڕێك و ڕاستیی بوونناسیی و تێڕوانینی مرۆڤی مسوڵمانی تێدا دەردەکەوێ، چۆنیەتی تێڕوانینیەتی بۆ سروشت و ئەودیو سروشت (الطبیعة وما وراء الطبیعة)، کە بە زاراوەی قورئان:

﴿...ماتُبۡصِرُونَ۝٣٨وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ۝٣٩﴾[1] یان

﴿...ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ...﴾[2]ی پێ دەگوترێ.

چونکە لە کۆنەوە، زانا و لێکۆڵەرەوانی دنیا، سەبارەت بە مەسەلەی (سروشت وئەودیو سروشت- فیزیك و میتافیزیك ) بوونە دوو دەستە:

أ- دەستەیەکیان گوتوویانە: ئەوەی خاوەنی (بوون) بێ و، لە دنیای واقیع دا هەبێ، بەس (ئەودیو سروشت)ە و، سروشت و دیاردە و

---

(١) ﴿...ماتُبۡصِرُونَ۝٣٨وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ۝٣٩﴾ الحاقە: ٣٨ - ٣٩. واتە: ئەوەی دەیبینن و ئەوەی نایبینن.

(٢) ﴿...ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ...﴾ بەشێکە لە ئایەتی (٢٢) لە سورەتی (الحشر) واتە: پەنهان و ئاشکرا.



ڕواڵەتەکانی، بەس سێبەر و خەیاڵ و ڕەنگدانەوەی ئەودیو سروشتن، فەیلەسووفە ئایدیالیست (مثالي)ەکان، پێشەنگ و سەرقافڵەی ئەو جۆرە بوونناسیی و بۆچوون و تێڕوانینەن[1].

ب- دەستەی دووەم، ڕاست بە پێچەوانەی دەستەی یەکەمەوە دەڵێن:

جگە لە مادده (سروشت)ی بەرهەست، هیچ شتێکی دیکە بوونی نیە و، مادده ئەسڵ و بنچینەیە و هەموو دیاردەکانی دیکەی تاك و کۆمەڵ، لە ئایین و زانیاریی و ئەدەب و ڕەوشت و یاسا و... هتد. میوە و بەرهەمی درەختی گۆڕان و پەرەستاندنی ماددەن!!

ماتریا لیستەکانیش بەگشتی و مارکسییەکان بەتایبەتی، خۆیان بە نوێنەر و دەمڕاستی پلە یەك (درجة أولى)ی ئەم جۆرە بۆچوونە لەقەڵەم دەدەن.



بەڵام مرۆڤی مسوڵمان دەڵێ: نەخێر نە ئایدیالیزم و نە ماتریالیزم! چونکە ئێوە هەر کامێکتان ڕوویەکی بوون (وجود)ی دیوە و، لە ڕووەکەی دیکەی بێ هەواڵە، بەڵام نەدیتن و بێ ئاگابوون لە شتێك، هەرگیز نابێتە بەڵگەی نەبوونی ئەو شتە، بەڵکو: بوون (وجود) دوو بەشە:

١- بەشێکی بەرهەست و ماددییە، کە جیهانی سروشت (عالم الطبيعة)ی پێ دەگوترێ.

٢- بەشێکی نا بەرهەست و مەعنەوییە، کە جیهانی ئەودیو سروشت (عالم ما وراء الطبيعة)ی پێ دەگوترێ.

---

(١)) بۆ پتر شارەزابوون دەربارەی (ئایدیالیزم) بڕوانە: ئاڵقەی دووەمی (ئیسلام و ڕێچکان) بەتایبەتی لاپەڕە ٦٣.



هەڵبەتە بابای مسوڵمان بۆ سەلماندنی ئەم بووناسیی و تێڕوانینەش، وەك ماتریالیست و ئایدیالیستەکان، بەس لاف لێدان و دەعوای ڕووت و قسەی بێ پشت و پەنای بەدەستەوە نیە، بەڵکو خاوەنی بەهێزترین بەڵگەیە، بۆ ئیسپاتی ڕاستیی و تەواویی بووناسیی و تێروانینی خۆی سەبارەت بە بوون، بەڵام ئێرە بەس جێی خستنەڕووی بووناسیی و تێڕوانین و بیروبۆچوونی مسوڵمانە، نەك سەلماندنی.

کەواتە مرۆڤی مسوڵمان، (نە خەیاڵچنێکی بێ هەستە، نە ماددە پەرستێکی پەستە).

## ٢- دنیـا و دوارۆژ:



١٣١

دووەمین مەسەلە کە هاوسەنگیی بووناسیی و تێڕوانینی مرۆڤی مسوڵمانی تێدا دەردەکەوێ، مەسەلەی هەڵوێستیەتی سەبارەت بە دنیا و دوارۆژ.

چونکە بە درێژایی مێژوو، مرۆڤایەتیی هەر کاتێك لە ڕێڕوونیی و ڕاستەشەقامی خوا دووركەوتبێتەوە، دووچاری دوو جۆرە هەڵوێست و تێروانینی هەڵە و دژ بە یەك بووە، سەبارەت بە دنیا و دوارۆژ:

أ- هەڵوێستی یەکەمیان کە ئینسانە دنیاپەرست و بەرچاو تەنگە بێ بڕوایەکان، دەمڕاستینی، بریتیە لە خۆ خەریك کردن و سەرگەرم بوونێکی بێتام بە ژیانی دنیا و ئارەزووەکانیەوە و، گوێ نەدان بە هیچ شتێك، ڕاست وەك کرمێکی گڵ خۆرکە! بە بەڵگە و بیانووی ئەوەی کە:

"نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە"!!

ب- هەڵوێستی دووەمیان کە ڕەنگە زیاتر کاردانەوە (رد فعل)ی لایەنگرانی هەڵوێستی یەکەم بێ، کە خەڵوەت نشین و دنیا نەویست و ڕەبەنەکان، سەرقافڵەینی، بریتیە لە دنیا بە هیچ نەزانین و ڕاکردن لە ژن و منداڵ و، خۆشاردنەوە لە کۆمەڵگا و، پەنابردنە بەر ئەشکەوت و پەنا و پەسیوو، خۆ کۆشمەڵەکردن! بە بەهانەی ئەوەی کە ژیانی دنیا هیچ نیەو، ئەوە ناهێنێ ئینسان خۆی لەگەڵ خەریك بکات و، ژیانی پێوە بەزایە بدات!

بەڵام مرۆڤی مسوڵمان لەو بارەوە، خاوەنی هەڵوێستێکی مام نێوەندییە و، هەر کام لەم دوو هەڵوێستانە، بە هەڵە و لاتەڵ دەزانێ و، دەڵێ: ئینسان دەبێ دنیا و دوارۆژان، وەك دوو تای تەرازوویێك ڕابگرێ و شتاقیان فڕێ نەدات، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ ....٧٧ ﴾القصص: ٧٧.

١٣٢

واتە: لەوەدا کە خوا پێی داوی، مەنزڵگای دوارۆژ ڕەچاو بکە و، بەشی خۆشت لە دنیا لەبیر مەکە.

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ليس بخيركم من ترك دنياه لآخرته، ولا آخِرَتَهُ لدنياهُ، حتى يصيب منهما جميعاً..) أخرجه الديلمي: ٥٢٤٩ عن أنس بن مالك.

واتە: چاکترینتان ئەو کەسە نیە کە لەبەر دوارۆژی واز لە دنیای بهێنێ، یان لەبەر دنیای، واز لە دوارۆژی بهێنێ، هەتا لە هەردووکیان دا وێکڕا خاوەن بەش نەبێ- نابێتە چاکترین کەس.

کەواتە: مرۆڤی مسوڵمان (نە دنیا نەویستە، نە دنیا پەرستە).

## ٣- جەستە و گیان (الجسم والروح):

مەسەلەیەکی دیکە، کە هاوسەنگیی بوونناسیی و تێڕوانینی مرۆڤی مسوڵمان دەسەلمێنێ، هەڵوێستیەتی سەبارەت بە گیان و لەش (الروح والجسد).

چونکە مرۆڤی مسوڵمان پێی وایە: لە گیان و جەستە دروست بووە و، لەسەریشی پێویستە ماف و پێداویستییەکانی هەر کام لە گیان و جەستەی دابین بکات و، زیادەڕۆیی و کەمتەرخەمیی لە مافی شتاقیان دا نەکات و، هیچیان بۆ هیچیان فەرامۆش نەکات.

چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾﴾ ص: ٧١ - ٧٢.

واتە: کاتێك پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو: من دەمەوێ مرۆڤێك لە قوڕێ دروست بکەم، ئنجا ئەگەر ڕێکمخست و لە گیانی خۆم[١] فووم پێداکرد، بە کڕنووش بردوویی بۆی بکەون.

هەروەها دەربارەی دابین کردنی پێاویستییەکانی جەستە و گیان، فەرموویەتی:

﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾﴾ الأعراف: ٣١.

---

(١) مەبەست لە (گیانی خۆم) ئەو گیانەیە، کە بەس خوا بۆخۆی دەزانێ چییە؟!



واتە: ئەی وەچەی ئادەم! بۆ چوونەلای هەر مزگەوتێك، خۆتان برازێننەوە و بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زیادەڕۆیی مەکەن، بێگومان ئەو- خوا- زیادەڕۆیانی خۆش ناوێن.

وەك دەبینین خوای زانا:

(خۆڕازاندنەوە) کە پێداویستیی لەشە، لەگەڵ (چوونە مزگەوت) کە پێداویستیی گیانە، لە لایەکەوە و، (خواردن و خواردنەوە) کە پێداویستیی جەستەن، لەگەڵ (زیادەڕۆیی نەکردن) کە داخوازی گیانە، لە لایەکی دیکەوە، پێکەوە گرێ دەدات!!

کەواتە مرۆڤی مسوڵمان:

(نە سۆفیلکەیەکی بێ هۆشە، نە ورگ پەرستێکی بۆشە).



## ٤- عەقڵ و دڵ:

هەڵوێستی مرۆڤی مسوڵمان، سەبارەت بە عەقڵ و دڵ، یان بیر و سۆز (الفکر والعاطفة)،یەکی دیکەیە، لەو بابەتانەی کە دەبنە بەڵگەی هاوسەنگ بوونی بووناسیی و تێڕوانینی.

چونکە زانا و فەیلەسووف و، خاوەن دڵان، هەر لە کۆنەوە و، ئێستاش دم بە دمە و بێنە و بەرەیان هەبووە و هەیە، لەو بارەوە کە ئایا ئینسان لەڕێی عەقڵەوە، دەتوانێ خۆی و دەوروبەری بناسێ، یان لەڕێی دڵەوە؟!، هەرچی فەیلەسووفەکانن، پێیان وایە کە ئینسان بەس لەڕێی عەقڵەوە، دەتوانێ بە ئامانج بگات و، خاوەن دڵانیش دەڵێن:

نەخێر، چونکە عەقڵ نابووت و ناتەواوە، لەڕێی دڵەوە نەبێ، هیچمان دەستگیر نابێ، بەتایبەتی ئەگەر بمانەوێ جیهانی ئەودیو سروشت بناسین.

بەڵام بابای مسوڵمان کە لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا بەرێوەدەچێ، بە هەردووکیان دەڵێ: بەهەڵەدا چوو ون! بەڵکو مرۆڤ بۆ ناسینی خۆی و دەوروبەری، حەوجێی هەر کام لە عەقڵ و دڵ دەبێ: لەڕێی عەقڵەوە، پەی بە ناسینی جیهانی ماددیی و پەیوەندییەکانی دەبەین و، لەڕێی دڵەوەش، لە سنووری مادده واوەتر دەچین و، دەتوانین جیهانی ئەودیو سروشت بناسین، بەڵام بە هاوکاریی و ڕێنمایی وەحیی خوا[1]، خوای زاناش فەرموویەتی:



١٣٥ ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ.....﴿١٩١﴾﴾ آل عمران: ١٩٠ - ١٩١.



واتە: بەڕاستیی لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و، لە جێگۆڕەکەی شەو و ڕۆژان دا، چەندان نیشانە هەن- لەسەر بوونی خوا- بۆ خاوەن عەقڵان ئەوانەی بە پێوەو بە دانیشتنەوە و لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن..

---

(١)) لە کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) و مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد) و، کتێبی دووەمی مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، بەدرێژیی ئەو بابەتە توێژراوەتەوە.

وەك دەیبینن: خوا هەم (بیركردنەوە) كە ئیشی عەقڵە و، هەم (یادی خوا) كە ئیشی دڵە، پێكەوە گرێ دەدات، كەواتە: مرۆڤ كە بیەوێ خۆی و دەوروبەری بناسێ- بەتایبەتی خوا جلّ جلاله- پێویستیی بە هەركام لە عەقڵ و دڵ و وەحیی هەیە، بەڵام هەریەكەیان لە سنوور و قۆناغی خۆی دا.

كەواتە: مرۆڤی مسوڵمان:

(نە فەیلەسووفێكی وەك ژیشكە[1]، نە خاوەن دڵێكی ئیشكە).

## ٥- نە تۆبزیی لێكران و، نە هەموو شت پێكران:







یەكی دیكە لەو مەسەلانەی كە بەڵگە و نیشانەی هاوسەنگیی بوونناسیی و تێڕوانینی مرۆڤی مسوڵمانن، ئەوەیە كە بڕوای وایە، ئینسان نە وەك جەبرییەكان (الجبریون) دەڵێن: پەڕەمریشكێكی بێ ئیرادە و دەستە پاچەیە، لە ئاقار ڕەشەبای توندی ویست و توانای خوادا و، نەوەك موعتەزیلە و هاوبیرانیشیان دەڵێن: هەموو شتێكە و بەدیهێنەری كردەوەكانی خۆیەتی، بەڵكو بڕوای وایە كە مرۆڤ:

(نە تۆبزیی لێكراوە و، نە ئازادی تەواوە[2]).

---

(١) ژیشك: ژووشك، جشك كە بە عارەبی (قنفذ)ی پێ دەگوترێ.

(٢) لە كتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) داو لە باسی: (قەزا و قەدەر)دا، ئەم باسە، بە فراوانیی توێژراوەتەوە.

## ٦- نە تاکی بەرهەڵدا و، نە کۆمەڵگای بێ سەڵا:

یەکی دیکە لەو مەسەلانەی کە بەڵگەی هەبوونی هاوسەنگیی و ڕێك و پێکیین لە بووننا‌سیی بیروبۆچوونی مرۆڤی مسوڵمان دا، تێڕوانینیەتی دەربارەی (تاك و کۆمەڵ).

ئەگەر لە ڕوانگەی بیرۆچکەی سەرمایەدارییەوە، تاك دەکرێتە گورگی هار و لە بەلەکی کۆمەڵ بەردەدرێ و، وەك وڵاخی بێ ساحیب، بەرهەڵدای وڵات دەکرێ و، هیچ کۆسپ و لەمپەرێکی لەڕێ دانانرێ، بەپێچەوانەشەوە: ئەگەر لە دەلاقەی بیرۆچکەی کۆمۆنیزم و مارکسیزمەوە، تاك دەکرێتە (جەڕ)[1]یکی بێ ئیرادەو دەستە پاچە، لە ئامێری کۆمەڵگادا و، دەکرێتە تەماتەیەکی پلێشاوە و، کەستەکە گلێکی وردوخاش، لەبن پێی کۆمەڵ دا!!

١٣٧

مرۆڤی مسوڵمان کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، دەڕوانێتە شتان، دەڵێت: هۆ سەرمایەداریی و کۆمۆنیزم!!

هەردووکتان هەڵەن و، ڕاست ئەوەیە کە تاك، بایی ئەوەندەی کە دەیسەلمێنێ (مرۆڤ)ەو، بورغیی و کەل و پەل نیە، دەبێ ئازادیی بدرێتێ، ئەگەرنا هەر کۆمەڵگایەك لە چەند تاکێکی پلێشاوە و بێ ناو، پێك بێت، ئەویش هەروەك تاکەکان پلێشاوە دەبێ! بەڵام نابێ تاك وەك گورگی هار بەرهەڵدای دەشتێ بکرێ و، هیچ سنوورێکی بۆ دانەنرێ و، هیچ ئەرکێکی سەبارەت بە کۆمەڵ، لەسەر پێویست نەکرێ، بەڵکو پێویستە مەودای ئازادیی و جم و

---

(١)) جەڕ: بورغ، بورغی.



جوڵ و چالاکییەکەی، هەر هێندە بێ، کە سەر نەکێشێ بۆ زیان گەیاندن بە کۆمەڵ و، سنوور بەزاندنی و شیرازە پچڕانی.

کەواتە: مرۆڤی مسوڵمان:

(نە تاکی پلێشاوە و بێ ناو و، نە کۆمەڵگای شیرازە پچڕاو).









## بواری دووەم

## هاوسەنگیی كەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمان لەبواری بیر و بڕوادا

### ١- نە بڕوا بە خوا نەهێنان، نە هاوبەش بۆ خوا دانان (لا الإلحاد ولا الشرک):

یەكەمین مەسەلە كە هاوسەنگیی، بیروبڕوای مرۆڤی مسوڵمانی تێدا دەردەكەوێ، هەڵوێست و بیرو بۆچوونیەتی سەبارەت بە خوا عزوجل.





بەدرێژایی مێژوو سەبارەت بە بوونی خوا، دوو هەوڵوێستی هەڵەی دژ بە یەك هەبوو ون: أ- یەكەم: بێ بڕوایی و بوونەوەر و ژیان و ئینسان بەبێ خاوەن لەقەڵەم دان. ب- دووەم: بڕوابوون بەچەند پەرستراویی (تعدّدُ الآلهة) و چەند پەروەردگارێكیش بۆ بوونەوەر بڕیاردان.

ئنجا یاسایەكی فیزیایی هەیە دەڵێ: بۆ هەر كارێك كاردانەوەیەك هەیە، لە ئەندازەدا بارتەقایەتی و لە ئاڕاستەدا پێچەوانەیەتی: (لكل فعل رد فعل يساويه فـي المقدار ويعاكسه فـي الاتجاه).

لە ڕاستیی دا ئەم یاسایەش بەسەر هەركام لە لایەنگرانی بیری بێ بڕوایی و، چەند پەرستراویی دا چەسپاوە.

بەڵام مرۆڤی مسوڵمان دەڵێ: هەردووكتان هەڵەن، هۆ بێ بڕوا و هاوبەش پەیداكەرینە!!



بەڵکو نە بێ بڕوایی، چونکە بوونەوەر شاری بێ ساحێب نیە و، نە چەند پەرستراویی، چونکە خوای ڕاستەقینە، بێ وێنە و، هاوتاو تاکە و، لە دروستکردنی بوونەوەردا، بەس پەرێز و شوێنەواری خوایەك دیارە، وەك زانایەکی خواناس گوتوویەتی:[1]

قدرة اللــه تتراءى فــي بديعِ صُنْعِهِ
ووحده الله تتراءى فـي وحْدَةِ خَلْقِهِ

واتە: دەسەڵاتی خوا، لە داهێنراویی و بێ وێنەیی دروستکراوی دا دەردەکەوێ و، یەکتایی خوا، لە یەکیەتیی، وەدیهێنراوی دا دەردەکەوێ.

کەواتە: مسوڵمان دەڵێ:

(نە بێ خوایی، نە زۆر خوایی، خواپەرستن بە یەکتایی).



## ٢- نە داڕووتاندن نە وێچواندن (لا التجريد ولا التشبيه):

مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ، کە ڕوونکەرەوەی هاوسەنگیی کەسایەتیی مسوڵمانە، لەبواری بیروبڕوادا: دان پێداهێنانیەتی بە هەموو سیفەتە بەرز و تەواوەکانی خوادا، بێ ئەوەی سەربکێشێ بۆ وێچواندن (تشبیە)ی خوا، بە هیچ کام لە دروستکراوەکانی.

لەم مەسەلەیەش دا دوو جۆرە بۆچوونی دژ بەیەك هەن:

---

(١) ئەم دوو ڕستەیە سەرباسی چەند بابەتێك بوون، کە خوا لێخۆش بوو: (أحمد زكي) لە گۆڤاری (العربي) کوێتی دا، لە ساڵانی حەفتایەکان دا دەینووسین.



أ- یەکیان بریتیە لەوەی کە هەموو سیفەتە بەرز و پەسندەکان لە خوا، دابڕێندرێن، وەك موعتەزیلەکان دەیانگوت، بە گومانی خۆیان بۆ ئەوەی لە سۆنگەی دان هێنانەوە بە سیفەتە ئەزەلییەکانی خوادا و، سەرەنجام تەبەننیی کردنی چەند لەمێژینەك (تعُّدد القُدَماءْ)دا، دووچاری هاوبەش پەیداکردن (شرك) نەبن!

ب- بۆچوونی دووەم ئەوەیە کە ئەو سیفەتانەی بۆ خوا بڕیار دەدرێن، هیچ جیاوازییان پێ نەکرێ، لەگەڵ سیبفەتی بەندەکان دا، کە لە حاڵێکی واش دا، وێچواندن (تشبیە) دێتەدی!

کەواتە: مرۆڤی مسوڵمان دەڵێ: (نە سیفەت نەبوون و، نە وێچوون، وەك بۆ خوا پێویستە، بڕوا پێ بوون).





٣- نە نەتەوەپەرستیی، نە بێ هەست و نەستیی:

یەکی دیکە لەو مەسەلانەی هاوسەنگیی و ڕێك و ڕاستیی، بیروبڕوای مرۆڤی مسوڵمان دەخەنەڕوو، بریتیە لە هەڵوێستی دەربارەی مەسەلەی نەتەوایەتیی و نیشتمانپەروەریی.

هەڵبەتە مەسەلەی (نەتەوایەتیی)یش، وەك زۆر مەسەلەی دیکە، لەم ڕۆژگارەدا دوو جۆرە بیروبۆچوونی هەڵەی بەراوەژووی یەکی، دەربارە هەن:

أ- یەکیان زیادەڕۆیی کردنە لە خۆشەویستیی نەتەوە و نیشتمان دا، کە زۆر جاران دەبێتە جۆرێك لە جۆرەکانی بتپەرستیی و هاوبەش بۆ خوا بڕیاردان.



ب- ئەوەی دیکەشیان کەمتەرخەمیی و بێ وەفایی نواندنە سەبارەت بە گەل و نیشتمان.

بەڵام مرۆڤی مسوڵمان دەڵێ:

(نە گەل و خاك و ئاو پەرستم، نە بابایەکی بێ هەست و نەستم)!

## ٤- ئایینی نەگۆڕدراوو، زانیاریی تەواو:

هەڵوێست و بۆچوونی مرۆڤی مسوڵمان، دەربارەی پەیوەندیی نێوان ئایین و زانیاریی، یەکی دیکەیە لە دروشم و نیشانەکانی هاوسەنگیی بیروبڕوای.



سەبارەت بە ئایین و زانیارییش، دیسان دوو بیروڕا و هەڵوێستی هەڵەی پێکەوە دژ هەن، یەکەم: تەنیا بڕوابوون بە ئایین و، چاو لەسەر چڕداگرتنی و لا نەکردنەوە بەلای زانیاریی دا، دووەم: بەس بڕوابوون بە زانیاریی و خۆ لەسەر کورت هەڵێنانی و، گوێ نەدان بە ئایین. ١٤٢



بەڵام مرۆڤی مسوڵمان ئەم دوو ڕایەی هەردووك پێ هەڵە و لاتەڵن و، ئەو دەڵێ:

لەنێوان ئایینی نەگۆڕاوو دەستکاریی نەکراوو، زانیاریی ڕاست و تەواودا، هیچ جۆرە ناکۆکیی و دژایەتییەك نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە: تەواوکەری یەکدین، چونکە لەڕێی زانیارییەوە، پەی بە یاسا و دەستوورەکانی گەردوون و دەوروبەر دەبەین و، ئایین و بەرنامەی خواش ڕێڕوونییمان دەکات و تێمان دەگەیەنێ: چۆن بیربکەینەوە و چی بکەین

و چی نەکەین و، لەگەڵ خواداچۆن بین و لەگەڵ خەڵکی دا چۆن ڕەفتار بکەین؟ بە واتایەکی دیکە دەڵێین: ئایین و زانیاریی هەردووکیان (شارەزایی)ین، ئایین شارەزاییەکە لەبەر تیشکی قسە و وتاری خوادا وەدەست دێ، زانیاریی (علم)یش شارەزاییەکە لەبەر تیشکی پەیبردن بە نهێنییەکانی دروستکراوی خوادا، دەستگیر دەبێ، ئنجا بێگومان وتار و کرداری خواش، مەحاڵە پێکەوە دژ و نەگونجاو بن.

کەواتە مرۆڤی مسوڵمان:

(خاوەنی ئایینی نەگۆڕاوو[1]، زانیاریی ڕاست و تەواوە).



## ٥- ئافرەت لەنێوان هەبوون و بێ ناو بوون دا:





یەکی دیکە لەو مەسەلانەی، کە مرۆڤایەتیی بەهۆی دوورکەوتنەوەیەوە، لە ئایین و ڕێڕوونیی خوا، تێیدا دووچاری زۆر تێنووسان (إفراط) و بەزایەدان (تفریط) بووە و، بەجارێکی کارەکەی لە گرێژەنە بردوە، مەسەلەی سەرنجدانی ئافرەتە:

أ- لەلایەکەوە دەستەیەك کە من ناوم لێ ناون: (دەردە ئافرەت گرتوو) بەناوی داواکردنی مافی ئافرەت و ئازادکردنی ئافرەتەوە، ئافرەتی

---

(١) مەبەستمان لە (ئایینی نەگۆڕاو) ئەو بەرنامە و ئایینە کۆتاییەی خوایە، کە دەستکاریی نەکراوە و نەگۆڕڕاوە، لە کتێبی پێنجەمی مەوسووعەی (بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا) باسێکی سەربەخۆمان لەو بارەوە کردوە و، خستوومانەتەڕوو کە نە ئایین (ئیسلام) هەمووی وەستاوە و، نە ژیانیش هەمووی گۆڕاوە.
هەروەها لە کتێبی: [تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی...]یش دا بەهەمان شێوە.

کلۆڵیان لەزۆر جێیان ـ لەوە هەر گەڕێ، کە کە کردۆتە بووکەشووشە و شمەك و کەل و پەل ـ دووچاری دەردی پلێشانەوە و بێ ناویی و، کەسایەتیی لەدەستدان کردوە، چونکە لە ئەرکە سروشتییەکەی خۆی، هەڵیان ئەنگاوتوە و ملیان پێ وەبەر ئیش و کاری پیاوەوە ناوە، ئنجا لەئەنجامی ئەو ڕوو پێ وەرگێڕان و لە ڕێ لادرانەدا، لە سەرێکەوە، نەیتوانیوە ببێتە پیاو و، لە سەرێکی دیکەشەوە، بەهۆی جێ بەجێ نەکردنی ئەرکی سروشتیی خۆی و، خۆ تێ هەڵقورتاندنی لە ئەرکی پیاوەوە، خەسڵەت و ئیمتیازەکانی ئافرەتایەتیی لەدەست داون، وەك سۆز و بەزەیی و، ئەندام نەرمیی و، دەنگ ناسکیی و، منداڵ بوون و، دڵ بە ماڵ و مێردان خۆش بوون و، پەروەردە و بارهێنانی منداڵ و...هتد!!

ب- لەلایەکی دیکەشەوە: دەستەیەکی دیکە بەناوی ئایین و عورفی خێڵەکیی و بنەماڵەییەوە، ئافرەتیان لەو مافە ڕەوا و سروشتییانەی کە خوا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) داویانەتێ، بێ بەش کردوە[1]و، هەتا کچە و لە ماڵێ بابیەتی، هیچ جۆرە مافێکی نیە لە هەڵبژاردن و دیاریی کردن و، ویستن و نەویستنی هاوسەری دا و، کە دەچێتە لای مێردیش، هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ و، زیاتر وەك مەڕ و ماڵات، یان (پاڵێتی پاش مێشان)[2] سەیر دەکرێ، ئنجا ئەو جۆرە ڕەفتار و هەڵس و کەوتە نا شەرعیی و بێ ویژدانانەیە، بە



---

(١) ئەوە کاتی خۆی زیاتر وابوو و، ئێستاش واقیعەکە وەك باری لاری سەر پشتی ولاخ، بە لایەکەی دیکەدا لاربووە! لادانیش لە شەریعەت، بەهەر لایەك دابێ، هەر لادانە، چ لێی تێپەڕێنی، چ لێی بەجێ بمێنی.

(٢) (پاڵێتی پاش مێشان) بەو پەڕۆ و پاڵتەیە دەڵێن، کە دەئاخنرێتە دواوەی ئەو خەڵێفەوە کە پوورە هەنگی تێ دەکرێ.



گێڕانەوەی چەند قسەیەکی هەڵبەستراوی بەناو فەرموودە (حدیث) ئاراستە دەکرێ و، ڕەشەرع دەخرێ، وەك:

(عقولهن في فروجهن، يعني النساء) واتە: عەقڵیان لە کۆشیان دایە یانی ئافرەتان).

جا ئەم قسەیە بە فەرموودە لەقەڵەم دراوە، بەڵام درۆیە، وەك خاوەنی (كشف الخفا ومزيل الإلباس عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس) دەڵێ.[1]

یان (شاوروهن وخالفوهن) واتە: ڕاوێژیان پێ بکەن، بەڵام بەقسەیان مەکەن!!



145



ئەمەش دیسان بەناو فەرموودە (حدیث)یە، بەڵام وەك خاوەنی کتێبی ناوبراو دەڵێ، فەرموودە نیە.[2]

ئنجا مرۆڤی مسوڵمان دەڵێ: نەخێر، نە زۆر تێنووسان، نە بەزایەدان، ئافرەت پێویستە لە جوغزی ئەنجام دانی ئەرکی سروشتیی خۆی دا، ئازادبێ، بەڵام ئازادییەك نا، کە لە شیرازەی شەرع دەربچێ، دەنا ئەوکاتە لە (ئازادیی) دەشۆرێ و، دەبێتە بەرهەڵدایی و بێ بەندوباریی.

بەکورتیی هەڵوێستی مرۆڤی مسوڵمان، سەبارەت بە ئافرەت ئەوەیە کە: (نە پلیشانەوە و بێ ناو بوون، نە کۆیلەیی و ژێردەستە بوون).

---

(١) بڕوانە ب٢ لاپەڕە (٨١).

(٢) بڕوانە ب٢ لاپەڕە (٤).

٦- ڕێزگرتن لە بیروڕای پێشینان و، بڕوابوون بە گۆڕانکاریی و داهێنان:

مەسەلەیەکی دیکە، کە بەڵگەی هاوسەنگیی بیروبڕوای مرۆڤی مسوڵمانە، چۆنیەتی بیروڕا و هەڵوێستیەتی سەبارەت بەو کەلەپوورەی کە پێشینانمان بۆیان بەجێ هێشتووین و، ئەو شتانەی کە لەئەنجامی گۆڕانکاریی و پەرەستاندن و گەشەکردن دا دێنە کایەوە.

چونکە خەڵکی لە ئاقار ئەم مەسەلەیەش دا، وەك زۆر مەسەلە و بابەتی دیکە، دیسان دووچاری زیاد تێنووسان و، بەزایەدان و، دوو هەڵوێست و بیروڕای ناڕێك و دژ بە یەك بوو ون:

أ- هەندێك کەس پێیان وایە: سەنگی مەحەکی چاکیی و خراپیی، کۆنیی و نوێیەوە، شت هەتا کۆنتر بێ و تەمەنی پتر بێ، ڕاستتر و چاکتر و متمانەپێکراوترە!! بۆ وێنە: هەندێك نیمچە خوێندەواری (بەناو مەلا) هەن کە کتێب هەتا زەردتر و شڕتر بێ و، مێژووی نووسینی کۆنتر بێ، زیاتریان بەدڵەوە دەنووسێ!! ١٤٦

ئەو جۆرە کەسانە پێیان وایە: کە زانیاریی و شارەزایی بەس پێشینانمان هەیانبووە و، تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت، لەسەر چەند زانایەکی کۆن و ڕابردوو تاپۆکراوە، کە بە ژمارەی قامکان دەژمێردرێن![1] تەنانەت هی وایان هەبووە و هەیە، کە پێی وایە هەرکەسێك بەبێ بەدەستەوە گرتنی تەفسیرێکی کۆن، دەست لە مانا

---

(١) لە کتێبی: (زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟)دا، تیڕوانینی ڕاست و دروستی مرۆڤی مسوڵمانمان، دەربارەی زانایان و بەرهەمەکانیان خستۆتەڕوو.

لێکدانەوەی قورئانێ وەربدات، ئەوە کارێکی یەکجار بێ شەرعیی و ناڕەوای کردوە، با مانا لێکدانەوەکەشی ڕاست و دروست بێ و، خەڵکیش سوودی لێ وەربگرێ!

تەنانەت (کۆلکە مەلای) وامان دیوە، پێی وابووە: گەورەترین گیروگرفتی گەلی کوردی مسوڵمان ئەوەیە، کە لەم ڕۆژگارەدا، خەریکە قورئانی بە زمانی کوردیی بۆ تەفسیر بکرێ و، لەکتێبی پەڕ سپیی دا، باسی ئیسلامەتیی بۆ بکرێ[1]!!

بەڵام هەیهوو هەیهوو! نەزانان لەبێ ئاگاییەکی چەند بێڕەزا دان.!!

ب- هەندێکی دیکە هەن، کە ڕاست بە بەراوەژوووەوە دەڵێن: سەنگی مەحەك و نیشانەی ڕاستیی و چاکیی هەر شتێك، ئەندازەی تازەیی و نوێیەتی و شت هەتا نوێتر و تازە بابەتتر بێ، چاکتر و تەواوتر و ڕاستترە! بەکورتیی دەڵێن: چونکە ماددە و ژیان و ئینسان و هەموو شتێك، لە گۆڕان و گەشەکردن و پەرەستاندن دایە، هەموو شتێکی ئەمڕۆ لە هی دوێنێ و، هی دوێنێ لە هی پێرێ، چاکتر و تەواوترە!

بەڵام مرۆڤی مسوڵمان کە لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت و، چاودێریی عەقڵ و، یارمەتیی زانیاریی دا بەرێوەدەچێت، دەڵێ:

نەخێر، نە کۆنەپەرستیی و نە تازەپەرستیی، بەڵکو هەق ویستیی و ڕاستیی دۆستیی!

---

(١) ئەوەش باسی ماوەیەکی زۆر لەوەوپێشە و، وەك پێشتر گوتمان: ئەم نووسینە هی زیاتر لە سی (٣٠) ساڵ لەمەوبەرە!



سەنگی مەحەكی چاكیی و خراپیی هیچ شتێك، كۆنیی و تازەیی ئەو شتە نیە، چونكە شت هەیە كۆنەو چاكیشە و، شتیش هەیە تازەیە و خراپیشە و، چاكیی و خراپیی، دوو شتی زاتیی شتانن و، پەیوەندییان بە كۆنیی ونوێیانەوە نیە، كەواتە بۆ دۆزینەوەی چاكیی، یان خراپیی هەر شتێك، دەبێ لە خودی ئەو شتە ڕامێنین و وردبینەوە، نەك لە ئەندازەی تەمەنی، یان لە بەساڵان دا چوویی و گەنجیی خاوەنەكەی، عەلی خوا لێی ڕازی بێ گوتەنی: (لا یعرف الحق بالرجال، وإنما یعرف الرجال بالحق) واتە: «ڕاستیی» بەهۆی پیاوانەوە ناناسرێ، بەڵكو پیاوان بەهۆی «ڕاستیی» یەوە دەناسرێن.

بەڵێ لەوەتەی ئینسان لەسەر زەوی دەژی: (٢+٢) هەر كردوویەتە (٤) و، (ڕاستیی و، وەفاداریی و، فیداكاریی و، خۆبەكەمزانین) هەر بە ڕەوشتی پەسەند و، (درۆ و، بێ نمەكیی و، ترسنۆكیی و، خۆبەزلگریی) هەر بە ڕەوشتی دزێو لەقەڵەم دراون و، مەحاڵە لە داهاتووش دا گۆڕانیان بەسەردا بێت.





كەواتە مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە كە:

لاساكردنەوەی كوێرانەی پێشینان، یان فڕێ دانی بەرهەم و كەلەپووریان، هەروەها: بڕوانەهێنان بە شتی نوێ، یان بەڕاست زانینی هەر شتێك كە تازە دادێ، هەردووكیان هەڵە و ناتەواون و، هەڵوێست و بۆچوونی ڕاست و تەواو ئەوەیە، كە ئێمە عەودالی هەق و ڕاستیی و چاكە بین، لە هەر جێیەك بێ و، چ كۆن بێ چ نوێ.

# بواری سێیەم

## هاوسەنگیی کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمان، لە بواری جم و جۆڵ و چالاکیی دا

### ١- قسە و وتار و، کردەوە و ڕەفتار:

مرۆڤی مسوڵمان، وەك چۆن لەبواری بووناسیی و تێڕوانین و بیروبڕوادا، هاوسەنگ و تەرازووە، لە بواری ئەو جم و جۆڵ و چالاکییانەش دا، کە زادە و بەرهەمی بووناسیی و تێڕوانینی و، لەسەر بنچینەی بیروبڕوایەکەی هەڵدەچنرێن، هەر هاوسەنگ و ڕێك و ڕاستە.

یەکەمین مەسەلەش، کە بەڵگە و نیشانەی هاوسەنگیی کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمانە، مەسەلەی قسە و کردەوەیەتی.

مرۆڤی مسوڵمان، هەرگیز قسەی بێ کردەوە و، لاف لێدانی بێ بەجێهێنانی، لێ ناپشکوێتەوە،- بەمەرجێك مسوڵمانی کامڵ بێ- چونکە ئەو دەزانێ کە قسەی بێ کردار و وتاری بێ ڕەفتار، سەرەڕای ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردوە و بە پیشەی جوولەکە و دەغەڵانی حیساب کردوە[1]، هیچ بەرهەمێکیشی نیە و بگرە زیانی پترەو! کورد گوتەنی: (بنەتۆوی خۆشی ناکاتەوە)!!

---

(١) خوا بە جوولەکەکانی فەرمووە: ﴿أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾ البقرة: ٤٤. هەروەها بە کەسانێکی دەغەڵ و دڵنەخۆشی فەرمووە: ﴿ ...لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾﴾ الصف: ٢ - ٣.

زانایەك دەربارەی بێ بەرهەمیی قسەی بێ کردەوە، گوتوویەتی: (من وعظ بقوله، ضاع كلامه، ومن وعظ بعمله، نفذت سهامه) واتە:

هەرکەسێك بەقسەی- ڕووتی- ئامۆژگاریی خەڵك بکات، قسەکانی خەسار دەبن و، هەر کەسێك بە کردار ئامۆژگاریی بکات، تیرەکانی- نیشانە- دەپێکن.

زانایەکی دیکەش گوتوویەتی: (عمل رجل في ألف رجل، أبلغ من قول ألف رجل في رجل) واتە: کردەوەی پیاوێك لە هەزار پیاودا، کاریگەرترە لە قسەی هەزار پیاو لە پیاوێك دا.

بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان (وەستای قسان و کۆڵەواری دەستان) نیە، بەڵکو هەم شێری قسان و، هەم هی کردەوانە.



## ٢- هەم تەقوا و هەم غەزا:

مەسەلەیەکی دیکە کە هاوسەنگیی جم و جۆڵ و چالاکییەکانی مرۆڤی مسوڵمان دەردەخات، ئەوەیە کە، هەم تەقوای هەیە، هەم غەزا، واتە: هەم لە ڕژاندنی خوێنی جەرگ و هەناوان داو، هەم لە هەڵچۆڕاندنی فرمێسکی چاوان دا، بەش و پشکی هەیە!

یانی: نە سۆفیلکەیەکی بەستەزمان و فەقیرحاڵ و سەرکزەڵەیە؛ نە جەنگاوەرێکی زەبردەست و چەك بەشانی پڕ پەڵەیە!

دڵی لە بواری تەقوا و نوێژ و پاڕانەوە و زیکر و فیکردا، لە شووشە ڕوونتر و، لە بەفر سپی تر و، لە لۆکە نەرمتر و، لە دایکی جوانەمەرگ

مردوو بەکوڵترە، بەڵام لەبواری جەنگ و خەبات و، کوشت و کوشتار و زۆردار ڕەتاندن و، کافری، دوژمن بەزاندن دا، دڵی لە شاخ ئەستەمتر و لە پۆڵا ڕەقترە!

چونکە خوا فەرموویەتی ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ ﴾التوبە: ١٢٣.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەگەڵ ئەو بێبڕوایانەدا بجەنگن کە لێتانەوە نزیکن و، با زبریی و پتەوییتان پێوە شك بەرن و، بزانن کە بێگومان خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە.


١٥١


وەك دەبینین: خوای بەرز و مەزن (زبریی) و (تەقوا) یان (جەرگداریی) و (پارێزکاریی) پێکەوە گرێ داون و، لە پەنای یەکدی داناون، بۆ ئەوەی کەس زەینی خلیسکەی پێ نەبا و، گومان نەبات، کە تەقوا و تەقە، یان جەرگداریی و پارێزکاریی، پێکەوە دژن!

## ٣- هەم عیبادەت و هەم سیاسەت[1]:

زۆر لەمێژە گەلێك جۆرە بیروبۆچوونی خواروخێچ و هەڵە و بەراوەژوو، دەربارەی ئیسلام، لەنێو گەلانی ئیسلام دا بڵاوبوونەوە، ئنجا یەکێك لەو جۆرە بیروبۆچوونە هەڵە و خواروخێچانە، مەسەلەی دژایەتیی نێوان ئایین و سیاسەت، یان عیبادەت و سیاسەتە.

---

(١) لە مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا کە چوار کتێبە، بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

ئنجا یەکی دیکەش لەو بەڵگە و نیشانانەی کە هاوسەنگیی کەسایەتی مرۆڤی مسوڵمان دەسەلمێنن، لەبواری جم و جۆڵ و چالاکیی دا، بریتیە لە هەڵوێست و چۆنیەتیی چارەسەریی، سەبارەت بە مەسەلەی سیاسەت و عیبادەت و، پەیوەندیی نێوانیان.

لە ڕوانگەی مرۆڤی مسوڵمانەوە: سیاسەت (بەڕێوەبردن و مشورخواردنی کاروباری وڵات) نەك هەر لەگەڵ خواپەرستیی (العبادة) دا، پێکەوە دژ نین و تێك ناگیرێن، بەڵکو دوو شتی تێکهەڵکێشن و یەکدی تەواو دەکەن، چونکە وشەی (عبادة) دوو واتای هەن، یەکیان فراوان و گشتییە و، ئەوی دیکەیان تەسك و تایبەتیی.

١- واتای یەکەمیان، ئەم ئایەتە دەلالەتی لەسەر دەکات:

﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ الذاريات: ٥٦. ١٥٢

واتە: جند و مرۆڤم بەس بۆ ئەوە خوڵقاندوون، کە بمپەرستن.

وەك دەبینین: خوای بێ وێنە لەم ئایەتەدا، هەموو حیکمەت و ئامانجی خوڵقێنرانی مرۆڤ و جند، لەوەدا کورت هەڵدێنێ، کە خواپەرستیی بکەن، کە بێگومان ناتوانین بڵێین: مەبەست لە (عبادة) لێرەدا چەمك و واتا تەسك و تایبەتییەکەیەتی، چونکە ماقووڵ نیە بگوترێ: ئینسان و جند دەبێ دایم و دەردەم بێ پسانەوە و حەسانەوە، سەرگەرمی نوێژو و ڕۆژوو و ژیکر و دوعا و حەج و عەمرە بن، کە چەمکی تایبەتیی و تەسکیی وشەی: (عبادة) دەیانگرێتەوە.

کەواتە ناچارین بڵێین: مەبەست لە ڕستەی: (لیعبدون) - بمپەرستن - لێرەدا گەردن کەچیی و فەرمانبەریی، پان و بەرین و فراوانە، لە هەموو بوار و لایەنەکانی ژیان دا.

٢- دووەمین چەمك و واتای وشەی (عبادە) ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی لە وشەی ناوبراوی دەفامنەوە، کە پێنج درووشمەکان و هەر جۆرە چالاکییەکی دیکەی مەعنەویی، وەك قورئان و خوێندن و ژیکر و پاڕانەوە، دەگرێتەوە[1].

ئنجا ئەگەر چەمك و واتای تەسك و تایبەتیی وشەی (عبادة) لەبەرچاوبگرین، ئەوە هیچ جۆرە تێکگیران و دژایەتییەك لەنێوان وی و سیاسەت دا ڕوونادات، چونکە بوار و مەیدانی هەر کامێکیان جویٚ یە لە هی ئەوی دیکە.





هەروەها ئەگەر چەمك و واتای گشتیی و پان و بەرینی لەبەرچاوبگرین، کە لە ڕاستیی دا بەس ئەویش، واتای ڕەسەن و واقیعیی وشەی (عبادة)ە، ئەوە دیسان هیچ ناتەبایی و دژایەتییەك لەنێوان (عبادة) و سیاسەت دا نایەتەدی، چونکە ئەوکاتی سیاسەت و مشورخواردن لە هەڵسووڕاندنی کاروباری خەڵکی، دەبێتە بەشێك لە بەشەکانی خواپەرستیی مرۆڤی مسوڵمان، ئەمەش ئایەتێکی قورئان، کە باسی تێکهەڵکێشیی و پێکەوە جۆشدراویی عیبادەت و سیاسەت دەکات:

﴿...إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ یوسف: ٤٠.

---

(١) بەڵام لە ڕاستیی دا، چەمك و واتای دووەم زیاتر عورفی کۆمەڵگا دروستی کردوە و، لە مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا، کە چوار بەرگە، بەدرێژیی لەو بارەوە دواوین.



واتە: حوکم بەس هی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەوی کەس نەپەرستن، ئەوەیە ئایینی ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

وەك دەبینین: خوا شان بەشانی حوکم و بەنامەدانان، باسی خواپەرستیی دەکات و، دەیخاتەڕوو: کە بەس کاتێك دەبنە خواپەرستی ڕاست و تەواو، کە حوکم و سیاسەتتان لەلایەن خواوە بۆ دیاریی بکرێ، ئنجا دوای ئەوە یەکسەر دەفەرموێ: (...ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ...)، ئا ئەوەیە ئایینی ڕاست و تەواو، ئایین و بەرنامەی ڕاست و تەواو، ئەوەیە کە ئەو سەرچاوەیەی بەرنامە و پەیڕەوی عیبادەتی لێ وەردەگرن، بەرنامە و پەیڕەوی سیاسەتیشتان بەس لەوێ وەربگرن.



کەواتە: غەیری ئەوە، کە بریتیە لە لێك پچڕاندنی عیبادەت و سیاسەت، بە ئایین و بەرنامەیەکی تەواو و ڕاست، دانانرێ، چونکە ١٥٤ چەمك و واتای بەرفراوان و گشتی وشەی (عبادة) لە جوغز و لایەنێکی تەسك و کەم بەردا، کورت هەڵاتوە کە لایەنی مەعنەوییە.



کەواتە: مرۆڤی مسوڵمان دەڵێ:

نە ئایینی بێ سیاسەت، نە سیاسەتی بێ ئایین، خوا پەرستییەکی وا بەرین، دا بگرێ سەرانسەری ژین.



## بواری چوارەم

## هاوسەنگیی كەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمان، لە بواری خوو و ڕەوشت دا

مرۆڤی مسوڵمان ـ وەك لەپێشەوە گوتمان ـ لە سۆنگەی ئەوەوە كە شوێن كەوتووی بووناسیی و بیروبڕوا و بەرنامەیەكی ڕاست و هاوسەنگە، خاوەنی كەسایەتییەكی هاوسەنگە، لە هەموو بوارێك دا، لە بواری بووناسیی و تێڕوانین و چالاكیی دا و، لە بواری خووڕەوشت و ئاكاردا.





ئنجا ئێمە لە لاپەڕەكانی پێشوودا، لە هەرسێك بواری بووناسیی و تێڕوانین و، بیروبڕواو، جم و جۆڵ دا، ئەو هاوسەنگییەمان لە چەند خاڵێك دا خستەڕوو، ئێستاش لە بواری چوارەم (خوو و ڕەوشت) دا، هەوڵی خستنەڕووی ئەو هاوسەنگییە دەدەین، لە چەند خاڵێك دا:

١- یەكەمین شت كە هاوسەنگیی ڕەوشت و خووی مسوڵمانی تێدا دەردەكەوێ، ئەوەیە؛ كە تووڕەیی و بەزەیی، كە هۆی پەیدا بوونی توندیی و زبریی و، نەرم و نیانیین، وەك دوو تای تەرازوویێك هاوسەنگ ڕادەگرێ و، هەریەكەیان لەجێی شیاوی خۆی دا بەكاردێنێ، چونكە ئەو دەزانێ كە خوای كاربەجێ، هیچ شتێكی بێ هۆ و حیكمەت نەخوڵقاندوە و، دیارە تووڕەیی و بەزەیی، هەر كامێكیان ئەركێكی تایبەتی لە ژیانی مرۆڤ دا هەیە، بۆیە خوا لە مرۆڤ دا دایناون.

بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان بابایەکی لاسەنگ و لاتەڵ نیە، کە وەك دڕندەخووان لە جێی بەزەیی و سۆزیش، هەر تووڕەیی و توندیی بەکاربێنێ، یان وەك فەقیرحاڵۆکە و سەرکزەڵۆکان، لەباتی تووڕەیی و هێزیش، هەر بەزەیی و نەرمیی بەکاربێنێ، بەڵکو دەڵێ: نە نەرمڕەویی نە توندڕەویی، بەڵکو شەرعڕەویی.

خوای مەزن دەربارەی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە مسوڵمانی هەڵبژاردەن، فەرموویەتی:

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ . . . ﴿٢٩﴾﴾ الفتح: ٢٩.



واتە: موحەممەد پێغەمبەری خوایە و، ئەوانەی لەگەڵیدان، لەسەر کافران توندوتیژن و، لەنێو خۆیان دا بەبەزەیین. ١٥٦



بەڵام ئەوەندە هەیە نەرمیی و بەزەیی و سۆزنواندن، بنچینەی گشتییە لە ئینسانی مسوڵمان دا و، توند و زبریی و ڕەقیی و بێ ڕەحمیی نواندن، جاروبارە و، وەك دەرمان بۆ چارەسەر بەکاری دێنێ.

بە کورتیی:

مرۆڤی مسوڵمان (دەستێکی مەڵحەمە و دەستێکی درێشەیە!).

مەڵحەم بۆ سارێژکردنی زامی بڕواداران و، درێشە بۆ زەبرلێدانی چاوی بەدکاران.

## ٢- ترس و ئومێد (الخوف والرجاء):

مەسەلەیەکی دیکە لەو مەسەلانەی کە دروشم و نیشانەی هاوسەنگیی و تەرازووی ڕاوەستانی ڕەوشت و خووی مرۆڤی مسوڵمانن، هاوسەنگیی پاراستنیەتی لەنێوان ترس و ئومێددا.

بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان، چونکە زانایە و خوای خۆی دەناسێ و، دەزانێ چەندە بەرز و مەزن و پایەبەرز و بێ باکە، لە بەانبەری دا، هەست بە ئەوپەڕی شەرم و ڕێز و سام و هەیبەت و ترس دەکات و، لەلایەکی دیکەوەش: چونکە دەزانێ چەندە بەبەزەیی و میهرەبان و تاوان پۆشە، هەست بە هیوا و ئومێد و دڵ ڕوونیی و پشت قایمیی دەکات.


١٥٧


مرۆڤی مسوڵمان، هەم ترسی هەیە و هەم ئومێد، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ترس و هیوایەکەی هاوسەنگ و تەرازوون و، تەرازووەکەی بە هیچ لایان دا سەرناکات، کەواتە: بابای مسوڵمان، نە هێندە دەترسێ کە لە بەزەیی و میهرەبانیی خوا تەمابڕاوو بێ هیوا بێ، چونکە:

﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝٨٧﴾ یوسف: ٨٧.

واتە: بێگومان کومەڵی بێ بڕوایان نەبێ، لە بەزەیی خوا نائومێد نابن.

دیسان نەهێندەش هیوا و ئومێدی زۆرە، کە هیچ مەترسیی لە دڵ دا نەمێنێ و، بەتەمای بەزەیی و چاکەی خوا پشتێندێی لێ



بكاتەوە، چونكە ئەو دەزانێ كە بەتەمای چاكە و بەخششی خوا بوون، بەبێ كردەوە، لە فریودان و فێڵ و تەڵەكەی شەیتانەوەیە، خوا دەربارەی ئەو كەسانەی كە بەتەما و ئومێدی بەزەیی وین، فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢١٨﴾ البقرە: ٢١٨.

واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە و كۆچیان كردوە و، لەڕێی خوادا تێكۆشاون، ئەوانە بەئومێدی بەزەیی خوان و، خواش لێوردە و بەبەزەیی یە.

كەواتە: (مرۆڤی مسوڵمان بە دوو باڵی ترس و ئومێد، بەرەو لووتكەی ڕەزامەندیی خوا دەفڕێ).

١٥٨

## ٣- نە دەستبڵاویی نە چەنگ قووچاویی:

مرۆڤی مسوڵمان لە زۆربەی زۆری تێڕوانین و بیروبڕوا و جم و جۆڵ و ڕەوشتەكانی دا، بەوە هاوسەنگیی وەدەست دێنێ، كە لەنێوان زیادتێنووسان و بەزایەدان دا، لەسەر خەتی باریكی نێوەڕاست (وسط) ڕادەوەستێ، هەر بۆیەش خوای زانا فەرموویەتی:

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا.... ١٤٣﴾ البقرة: ١٤٣.

واتە: هەر بەو شێوەیە گێڕاومانن بە كۆمەڵێكی میانجیی...

ئنجا یەکی دیکە لەو ڕەوشت و خووانەی ئینسانی مسوڵمان، کە هاوسەنگیی و میانجێتی وی تێیان دا دەدرەوشێتەوە، ئەوەیە کە لە مەسەلەی ماڵ سەرفکردن دا، نە دەست بڵاوە، نە چەنگ قووچاوە، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾﴾ الإسراء: ٢٩.

واتە: نە دەستت پێوەند بکە تا گەردنت، نە تەواویش بڵاوی بکە، دەنا بە سەرکۆنەکراویی و پەککەوتەیی دادەنیشی.


١٥٩


هەڵبەتە دەست بەستران و پێوەندکران، کینایەیە بۆ ڕژدیی و چرووکیی، دەست بڵاوکردنیش، کینایەیە بۆ زیادەڕۆیی کردن لە ماڵ بەخشین دا، جا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوای زانای وردبین، وشەی: (وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً)ی لەگەڵ (مَلُومًا) و وشەی: (وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ)ی لەگەڵ (مَّحْسُورًا)دا بەراورد کردوون، چونکە بابای ڕژد و چرووك و چەنگ قووچاو، دەبێتە جێی ڕەخنە و گلەیی و گازندە و سەرکۆنەی خەڵك و، بابای دەست بڵاویش، سەرەنجام خەفەتبار دەبێ و پەکی دەکەوێ!!

## ٤- نە فیزودەمار نواندن، نە خۆزەبوون کردن:

یەکی دیکە لەو ڕەوشتە بەرز و پەسندانەی کە کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمانیان هاوسەنگ کردوە و تەرازوو ڕاگرتوە، ئەوەیە کە نە لە خۆ پێ زۆربوون دا زیادەڕۆیی دەکات، بەشێوەیەك سەربکێشێ بۆ فیز و دەمار نواندن و خۆ بەزلگرتن و، نە لە خۆبەکەمگرتن (تواضع) دا، بێ



تامی دەکات، کە سەربکێشێ بۆ خۆ پێ هیچ نەبوون و خۆ زەبوون کردن.

بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان، خۆی پێ بەرز و بەعیززەتە، بەڵام ئەو هەستکردن بە بەرزیی و عیززەتە، وای لێ ناکات کە ببێتە بابایەکی خۆبەزلزان (متکبر) و لووتی بچێتە عاسمانێ و، فیز و کەشخە بەسەر خەڵکی دا بکات، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ النحل: ٢٩.

واتە: دە جا لە دەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە ژوورێ، بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، خراپترین جێگای خۆبەزلزانان - دۆزەخ - ە.

١٦٠

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر، فقال رجل: إن الرجل يحب أن يكون ثوبه حسناً، ونعله حسناً، قال إن الله جميل يحب الجمال، الكبر بطر الحق وغمط الناس) أخرجه مسلم:٩١، والترمذي: ١٩٩٩، وابن حبان: ٥٤٦٦.

واتە: هەرکەسێك هێندەی گرانیی گەردیلەیەك - یان مێروولەیەکی گچکە - خۆبەزلگریی لە دڵی دا بێ، ناچێتە بەهەشتێ، پیاوێك گوتی: پیاو هەیە حەز دەکات بەرگەکەی چاك بێ و، پێڵاوەکەی چاك بێ! فەرمووی: خوا جوانە و جوانیی خۆش دەوێ، خۆبەزلگریی، ڕەت کردنەوەی هەق و خەڵك بە کەمگرتنە.

لە سەرێکی دیکەشەوە، بابای مسوڵمان، لەگەڵ هەست کردنی بە عیززەت و بەرزیی دا، خۆی بەکەم دەگرێ و، ڕێزی هەموو کەس



دەگرێ، بەڵام خۆبەکەمگرتنەکەی، لە ئەندازەی پێویست بەولاوە ناچێ، کە ببێتە: خۆ پێ هیچ بوون و خۆ زەبوون کردن، چونکە خوا فەرمووویەتی:

﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾﴾ آل عمران: ١٣٩.

واتە: بێ هێزیی پێشان مەدەن و غەمگین مەبن و، ئەگەر بڕوادار - ی تەواو - بن، بەس ئێوە بەرزترینن.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لاينبغي للمؤمن أن يُذلَّ نفسه) أخرجه أحمد: ٢٣٤٩، والترمذي: ٢٢٥٤، وابن ماجه: ٤٠١٦.

واتە: بڕوادار بۆی نیە خۆی زەبوون بکات.





کەواتە: مرۆڤی مسوڵمان، وێڕای هەست کردن بە بەرزیی و عیززەت، خۆشی بە کەم دەگرێ و، هەرچەندە فیز و دەمار بەسەر کەس دا ناکات، بەڵام خۆشی بۆ کەس زەبوون ناکات.

## ٥- نە باوەڕ بەخۆ نەبوون، نە لەخۆبایی بوون:

باوەڕبەخۆنەبوون (عدم الثقة بالنفس)، نەخۆشییەکی مەعنەوییە بەلای بەزایەدان (تفریط)دا و، لە بەرانبەری دا: نەخۆشیی لەخۆبایی بوون (الغرور) هەیە، ئنجا بێگومان ئەو دووانە هەردووکیان لادانن لە ڕاستەڕێ، یەکەمیان: بەزایەدان و کەمتەرخەمییە و، ئەوی دیکەیان: زیادتێنووسان و زیادەڕۆیی.

ئنجا مرۆڤی مسوڵمان هیچ کام لەو دوو نەخۆشییەی تێدانین، چونکە لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕوای بەخوا هەیە و، دەزانێ بەندەی



کێیە و، سەر بە خوایەکی چەندە بەرزو مەزنە! باوەڕی بەخۆی هەیە و، خۆی پێ سفری پاش فاریزە نیە! هەروەها لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە خۆی دەناسێ و، دەزانێ لەئاقار خوادا چەندە گچکە و بێ دەسەڵاتە و، چەندە کەم و ناتەواوە، خۆی لێ ناگۆڕێ و لەخۆی بایی نابێ، چونکە ماك و میکرۆبی نەخۆشیی خۆ لێ بایی بوون، ئاگا لەخۆ نەمان و خۆلەبیرچوونەوە و، خۆ لەلا گەورە و بێ ئیحتیاج بوونە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿... إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧﴾ العلق: ٦ - ٧.

واتە: بێگومان ئینسان یاخیی دەبێ - و خۆی لێ دەگۆڕێ - هەر کاتێك خۆی بە دەوڵەمەند زانی، بەڵام وەك گوتمان: مرۆڤی مسوڵمان هیچ کاتێك وا هەست ناکات کە بۆخۆی هەموو شتێکە و، دایم و دەرەم هەست بە حەوجێیی خۆی دەکات سەبارەت بە خوا. 

کەواتە:

مرۆڤی مسوڵمان هەرچەندە باوەڕی بەخۆی قایمە و، خۆی بەشت دەزانێ، بەڵام قەت ئەو باوەڕبەخۆبوون و خۆ پێ شتبوونەی، لە ئەندازەی سروشتیی دەرناچێ و نابێتە خۆ لێ گۆڕان.

٦- هەم بەستنەوە و گرێ دان، هەم ڕووکردنە خوا و پاڵ وێدان:

خوێنەری بەڕێز!

لێرەدا ئەو کورتە بەسەرهاتە یان قوڵە نەزیلەیە دێنین، چونکە پەیوەندییەکی پتەوی بەم باسەی ئێرەوە هەیە:

(ڕۆژێك عەرەبێکی دەشتەکیی هاتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە حوشترێکی پێ بوو، پێغەمبەر لێی پرسی: کوا حوشترەکەت؟ گوتی: لە دەرێ بەرهەڵدام کردوە و بەتەمای خوا لێی گەڕاوم و، پشتم بە خوا بەستوە! ئەویش لە وڵامدا پێی فەرموو: (اعقِلْهَا وَتَوكَّلْ) أخرجه الترمذي: ٢٥١٧، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٢١٢. واتە: بیبەستەوە و پشتیش بە خوا ببەستە.





ئنجا یەکی دیکە لەو خەسڵەت و ڕەوشتە ئیسلامییە پەسندانەی، کە دەورێکی کاریگەریان هەیە لە هێنانەدی هاوسەنگیی لە مرۆڤی مسوڵمان دا، ئەوەیە کە مرۆڤی مسوڵمان، نە هۆیەکان (الأسباب) فەرامۆش دەکات بە بەهانەی پشت بەخوا بەستنەوە و، نە خوا فەرامۆش دەکات و پشت گوێ دەخات، بەتەمای دەست بە هۆکارەکان (أسباب) گرتنەوە، بەڵکو لە عەینی دەست بە هۆیان گرتنی دا، پشتیشی بە خوا قایمە و، لە گەرمەی پشت بەخوا بەستنیش دا، هەوڵی دەستگیرکردنی هۆیانیش دەدات.

واتە: مرۆڤی مسوڵمان ئەوەندەی پێی بکرێ، لەڕێی دۆزینەوەو بەکارهێنانی یاسا و دەستوورەکانی سروشت و بوونەوەرەوە، هەوڵی بەئامانج گەیشتن دەدات، بەڵام لە دوو شتانیش بێ ئاگا نابێ:



یەکەم: دەزانێ کە یاسا و دەستوورەکان (قوانین)ی بوونەوەر، هیچ کامیان لەخۆڕا و بەتەنێ، واتە بە کارتێکردنی زاتیی و دوور لە ویست و دەسەڵاتی خوا، هیچیان پێ ناکرێ و، مێشیان پێ لە ئاو ناکرێ، کەواتە: وێڕای دیتنی هۆیەکان (أسباب) و یاساکان (قوانین)، شێتیی و نەفامییە، ئینسان لە هۆکارساز (مُسبِّب) و یاسادانەر (مقنِّن)یش بێ ئاگابێ، ئەو (مُسَبِّب) و (مُقَنِّن)ەی، کە بوون و کاریگەریی بە (أسباب) و (قوانین) بەخشیوە.

دووەم: دەزانێ کە کاروباری دنیا، بەس لەڕێی هۆیە مادییەکان (الأسباب المادیه)ەوە بەڕێوەناچێ و، لە پاڵ هۆیە بەرهەست و مادییەکان دا، چەند هۆیەکی نادیار و مەعنەوییش هەن و، کاریش دەکەنە سەر شتان، مادام وابێ هیچ ماقووڵ نیە، ئینسان هەندێك لە هۆیان (أسباب) لەبەرچاو بگرێ و،هەندێکیشیان فەرامۆش بکا و بەرهەڵدا بکا!!

پوختەی مەبەست ئەوەیە: کە مرۆڤی مسوڵمان ئەوەندەی پێی بکرێ و دەستی بڕوات، لەگەڵ هۆیە بەرهەستەکان دا خەریك دەبێ و، هەوڵی دابین کردنیان دەدات، بەڵام ئەوەندەی دەستی وێڕا نەگەیشتن و، پێی دەستگیر نەکران، ئەوە لەجیاتی بەزین و کۆڵ دان و، مەیدان بەجێ هێشتن و هەڵاتن، ڕوودەکاتە خوای پەروەردگاری خۆیی و، لەبەری دەپاڕێتەوە و بەکوڵ داوای لێ دەکات، کە ئەوەی بۆخۆی - بەڵام پاش ڕەنجدان و هەوڵدان - دەستی ناگاتێ و بۆی ناکرێ، یان تەواو ناکرێ، ئەو بۆی بکات، یان تەواو بکات.



ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە بابای مسوڵمان دەزانێ بوون (وجود) تێکڕا بە بەرهەڵست و نابەرهەستیەوە، لەژێر ڕکێفی ویست و دەسەڵاتی خوادایە، بەر لە دەست کردن بەهەر کارێکی شایانی باس، ناوی خوا دێنێ و، بۆ خوا و، بە پشت و قووەتی خوا، دەست پێ دەکات، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(كل أمر ذي بال لايبدأ فيه ببسم الله الرحمن الرحيم، فهو أبتر) أخرجه أبو داود: ٢٨٤٠، والنسائي في عمل اليوم والليلة: ٤٩٤.

واتە: هەر کارێکی گرنگ بە (بسم الله الرحمن الرحيم) کردن دەستی پێ نەکرێ، ئەوە دوابڕاو - و بێ خێر- ە.



١٦٥



کەواتە: مرۆڤی مسوڵمان، کەسێکە هەم هۆیەکان ڕەچاودەکات و حوشتری کاروباری دەبەستێتەوە و بەرهەڵدا ناکات و، هەم بەس هۆیە ماددییەکان نابینێ و، هەموو شتێك بەناوی خوا دەست پێ دەکات و، کە دەستیشی لە پچکی هۆیان بڕان، ڕووی مەبەستی لە خوا دەکات.

خوێنەری خۆشەویست!

ئێستاش دوای ئەوەی لە چەند بوارێك دا و، هەر بوارەش لە چەند مسەلەیەك دا، بۆمان ڕوون بۆوە، کە مرۆڤی مسوڵمان یان ڕاستتر بڵێم: (مسوڵمانی کامڵ) خاوەنی چ جۆرە کەسایەتییەکە و، زانیمان کە بابای مسوڵمان زەقترین و ئاشکراترین و بنەڕەتییترین نیشانە و دروشم و ئیمتیازێك کە پێیەوە دەناسرێ و، پێی لە غەیری خۆی جوێ دەکرێتەوە، بریتیە لە هاوسەنگیی و ڕێك و ڕاستیی و تەرازووبوون، چونکە:

**یەکەم: لە بواری بووناسیی و تێڕوانین دا:**

١- بڕوای بە سروشت و ئەودیو سروشت، یان ئاشکرا و پەنهان، هەیە.

٢- دنیا و دوارِۆژان، وەك دوو تای تەرازوویێك، ڕادەگرێ و شتاقیان بۆ شتاقیان فرێ نادات.

٣- جەستە و گیانان، پێکەوە دەکاتە دوو برای تەبا و، ماف و پێداویستیی هیچ کامیان لەبیر ناکات.

٤- عەقڵ و دڵان بەکاردێنێ و، شتاقیان بەرهەڵدا ناکات و لەقیس خۆی نادات.

٥- خۆی نە بەتۆبزیی لێکرا و (مجبور)، نە هەموو شت پێکراوو ئازادی تەواو، لەقەڵەم دەدات.



٦- بڕوای بە بەرهەڵدایی تاك و، بێ سەلایی کۆمەڵ نیە.

**دووەم: لە بواری بیروبڕوادا:**

١- بڕوای بە بێ خوایی، یان چەند پەرستراویی نیە.

٢- نە خوا لە سیفەتە بەرز و پەسندەکانی دادەڕووتێنێ، نە وە دروستکراوەکانیشی دەچوێنێ.

٣- نە بابایەکی ناسیۆنالیزم و نەتەوە پەرستە و، نە دژی نەتەوە و نیشتمان و، بێ هەست و نەستە.

٤-بڕوای بە تەبایی ئایینی نەگۆڕاوو[1]، زانیاریی ڕاست و تەواو، هەیە.

---

(١) یانی ئایینێکی ڕاست و ساغی نەگۆڕاوو دەستکاریی نەکراو، کە لەم

٥- بڕوای وایە كە دەبێ ئافرەت نە دیل و زەبوون و ژێر دەست بێ، نە پلێشاوە و بەرهەڵدا و بێ مەبەست بێ.

٦- هەم ڕێز لە بیروڕای ڕاستی پێشینانی دەگرێ، هەم بۆ گۆڕین و گەشەپێدان و بەرەوپێش بردنی كۆمەڵ، سەری دەخورێ.

**سێیەم: لە بواری جم و جۆڵ و چالاكیی دا:**

١- هەم مەردی قسە و وتارانە، هەم هی كردەوە و ڕەفتاران.

٢- هەم پارێزكارە، هەم شۆڕەسوارە و، بەتەقوای بێ تەقە و، غەزای بێ تەقوا قایل نیە.

٣- هەم مەردی میحرابی عیبادەتە، هەم جوامێری مەیدانی سیاسەت.



**چوارەم: لە بواری خوو و ڕەوشت دا:**

١- لە كاتی بەزەیی نواندن و میهرەبانیی دا، ئەوەندەی بلێی هێدیی و نەرمە و، كە كاتی تووڕەبوونیش هات، توندوتیژە و گوللەی گەرمە.

٢- لەخوا ترسانی و ئومێد بەخوابوونی، وەك دوو باڵی باڵندەیەك و، دوو تای تەرازوویێك، بارتەقای یەك و هاوسەنگن.

٣- نە لە ماڵ سەرف كردن دا، دەست بڵاوە، نە لە خێر و چاكەدا، چەنگ قووچاوە.

٤- نە فیز و كەشخە بەسەر كەس دا دەكات، نە خۆشی زەبوون و دەستە پاچە پێشان دەدات.

---

ڕۆژگارەدا تەنیا ئیسلامە.

٥- باوەڕ بەخۆبوون و عیززەت و بەرزیی لێ دەچۆڕێ، بەڵام هەرگیز لەخۆی بایی نابێ و خۆی لێ ناگۆڕێ.

٦- هەم کاروباری بە پەتکی هۆیان دەبەستێتەوە و گرێ دەدات، هەم ڕووشی لە خوایە و، داوای لێ دەکات و پاڵی وێدەدات.

بەڵێ ئێستا دوای ئەوەی ئەم باسانە ڕابردن، سوپاس بۆ خوا بێ پێچ و پەنا، سەلمێنرا، کە ئەگەر ئینسانێك هەبێ، خاوەنی کەسایەتیی (شخصیة)یەکی تێروتەواو هاوسەنگ بێ، بەس مرۆڤی مسوڵمانی کاملە.

# بەرهەمەکانی دانەر

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| | أ / کتێبە کوردییەکان | | |
| | قـورئـــان و ســونـنـەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیســلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟) و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم:سووڕەتەکانی:(الفاتحة)و(البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سـووڕەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سـووڕەتی: (النسـاء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سـووڕەتی: (الـمائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سـووڕەتی: (الأنعـام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفســـیـری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی شەشەم : سـووڕەتی: (الأعــراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفســـیـری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی حەوتەم: سووڕەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سـوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سـوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سوورەتەكانی: (الرعد، إبراهیم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێزدەم: سـوورەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چواردەم: سـوورەتی: (الإسرا) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پازدەم: سوورەتەكانی: (الكهف، مریم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٨ | شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٩ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسە و گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| بیـروبڕواو فیكری ئیسـلامیی | | | |
| ٢٠ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسـلام و ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ٢١ | ڕێبـازی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) كامەیە ؟! | چـاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو كتێبی (مسـولمانی كامل: بەشی یەكەم: بیروباوەڕی مسـولـمان) |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | پڕۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێركردنی ئیسلامییانە | چـاپی یەك/١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو كتێبی: (پڕۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی) |
| ٢٣ | پڕۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ٢٤ | بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی چوار/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ٢٥ | چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم، سەرنجێكی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی شەش/٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و توركیی و فارسییش |
| ٢٦ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| ٢٧ | ناوە هەرەجوانەكانی خوا"سبحانه وتعالى" | چاپی یەك ٢٠١٣/ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ |
| ٢٨ | بەرگی یەكەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢٩ | بەرگی دووەم: خوا بەیەكگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٣٠ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەكگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٣١ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەكانی خوا، كتێبەكانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٣٢ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | - |
| ٣٣ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٤ | مسـوڵمـانـی کامـڵ: بەشـی یەکەم: بیـروباوەڕی مسـوڵـمان | چـاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٣٥ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقـە لەهەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٣٦ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢ چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٧ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طەحاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٨ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحـــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٣٩ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لە ئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و، شێوەزاری کرمانجیی |
| ٤٠ | درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢٠ | |
| مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا | | | |
| ٤١ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەر گوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | ـ |
| ٤٢ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | ـ |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٣ | كتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٤٤ | كتێبی چوارەم: پایەكانی بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | _ |
| ٤٥ | كتێبی پێنجەم: چەند پرسێكی فیكریی هەنووكەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | _ |
| | زنجیرەی: باچاكتر ئیسلام بناسین! | | _ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە |
| ٤٦ | ئاڵقەی یەكەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | _ |
| ٤٧ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاه والسلام" | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | _ |
| ٤٨ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٤٩ | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | _ | دوایی خرایە نێو كتێبی: (خواناسیی, ئایین, ئیمان) |
| ٥٠ | بیررو بڕوا | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| | فیقهـی ئیسـلامیی | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرسـتیی ئیسـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٥١ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاك و خاوێنیی | | |
| ٥٢ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٥٣ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥٤ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٥٥ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسـ وكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوە |
| ٥٦ | جـەژن و یـادو بۆنەكان و هەڵسـەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٥٧ | چـەند بابەتێكی هونـەریی لەبەر ڕۆشـنایی قورئـان و سـوننەتـدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمـانی فارسـییش تەرجەمـە كراوە |
| ٥٨ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سـامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | تەزكیـەی نەفس و ڕەوشت و ئاكار | | |
| ٥٩ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٦٠ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزكیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسـییش |
| ٦١ | تەزكیەو تەبایی و، یەكڕیزیی و برایی | چاپی یەك/١٩٩٨ | |
| ٦٢ | مزگەوتەكانی كوردسـتان لەنێوان ئاوەدانكردنەوەو وێرانكردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٦٣ | گەڕانەوە بۆ لای خـوا (سبحانە وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان و، وازهێنان لە گوناه و سـەرپێچیی و، گۆڕانكاریی ڕیشەیی بەسـەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٦٤ | شـەهید كێیەو چ پلـەوپایەیەكی هـەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |







| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٥ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٦٦ | گیانی ژیـان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٦٧ | مەوســـووعەی: ڕەوشت و ئاكاری ئیســـلامیی لەبەر ڕۆشـنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٦٨ | ئەدەب و ڕەوشتە كۆمەڵایەتییەكان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی و عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | بانگـەوازو كاری ئیســـلامیی | | |
| ٦٩ | كۆمەڵـی خـــوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٧٠ | پێشمەرگەی ئیســلام، یان مســوڵمانی موجاهید كایەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨ چاپی چوار/٢٠٢٠ | |
| ٧١ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیســـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٧٢ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٧٣ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێ | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٧٤ | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| ٧٥ | چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیســـلامییەكانی كوردسـتان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٧٦ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەكی گەش و ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧٧ | ئیســـلام و كێشــە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٧٨ | زانایانی ئیســـلام كێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عـەرەبی |
| ٧٩ | كۆمەڵی ئیســلامیی: ئامانج و هەڵوێســتەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٠ | هەڵسـ وكەوت لەگەڵ خەڵكی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عـەرەبی |
| ٨١ | چۆن لە جیهاد تێ بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٨٢ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سـەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٣ | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ كردمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٨٤ | جیهـاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٨٥ | چەند ڕێـڕوونییـەك بۆ خوشــك و برایانمان لە هەنـدەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٦ | ئیسـلام و مسـوڵمانەتیی و كاری ئیسـلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٨٧ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨٨ | بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسـەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩ چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە: ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان. ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٨٩ | هەڵوەشاندنەوەی بیـروڕاو ڕەفتارە پەڕگیـرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥ چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٩٠ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسـلام نەمانخاتە دوودڵـیی و گومان | چاپـی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٩١ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شـوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چـاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٩٢ | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چـاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| | زنجیرەی بنەمـا شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | | |
| ٩٣ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٩٥ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| | وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | |
| ٩٦ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسـلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٩٧ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسـلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٩٨ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسـلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | |
| ٩٩ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٠٠ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ١٠١ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی سێ/٢٠٠٥ چاپی چوار/٢٠١٨ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠٢ | چارەسـەری کێشـەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| ١٠٣ | حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٠٤ | جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| سیاسـەت و حوکمڕانیی | | | |
| ١٠٥ | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| مەوسـووعەی: ئیسـلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | | | چاپی یەك / ٢٠١٤ |
| ١٠٦ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ١٠٧ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ١٠٨ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان - جێبەجێکردن - دادوەریی | | |
| ١٠٩ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ١١٠ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٧ |
| ١١١ | قوڕئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | | چاپی یەك/٢٠١٨ |
| ١١٢ | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ئافرەت و خێزان | | | |
| ١١٣ | ئافرەتی مسـوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | | چاپی یەك / ٢٠٠٣<br>چاپی دووەم / ٢٠٠٣ |
| ١١٤ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سـایەی شـەریعـەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |







| | | | |
|---|---|---|---|
| مـێـــژوو | | | |
| ١١٥ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەرس و پەندەكانـی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١١٦ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١١٧ | بەركوڵێكی كاروچالاكیی و ڕووداوەكانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |
| دیدارو گفت وگۆ | | | |
| ١١٨ | سـنوورە قەدەغەكان مەشكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | - |
| ١١٩ | ئەشكەنجــەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زینــدانی داگیـركەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی كراوەو چـاپ و بڵاوكراوەتەوە،هەروەها بۆزمانی ئینگـلیزیش وەرگێڕراوەوچـاوەڕێی چاپە |
| ١٢٠ | گەنج لە چەمكە هەنووكەییەكاندا | چاپی یەك ٢٠١٠/ | |
| زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان | | | |
| ١٢١ | گەنجەكانـمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی كردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسـییش وەرگێڕراوە |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٢ | با وریا بیـن ! داڕووخـانی ڕەوشـت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبـات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٢٣ | بەدوورخســتنەوەی ئافرەت لە ئیســلام چ زیانێـك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | - |
| ١٢٤ | چۆنیەتی بوونە پێشـەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٥ | ســیاســەتی ئیســلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٦ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٢٧ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سـەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٨ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سـەنگی مەحەکی مسـوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٢٩ | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە کآ دەکرآ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٣٠ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویســتە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٣١ | واقیعی هەرێمی کوردسـتان ، دیدێکی ئیســلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٣٢ | ســروشـت و پایەکانی خێزان و مەسـەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عـەقـڵـدا (١٢) | چـاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقـە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە) دا بلاَوکراوەتەوە |
| ١٣٣ | کاری ئیســلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێـك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣٤ | حوكمی لە ئیســـلام هەڵگەڕانەوەو هەڵســـەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٣٥ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٣٦ | لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٣٧ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣ چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٣٨ | ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٣٩ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسەرێكی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٤٠ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆكار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٤١ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەكان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | ب/كتێبـە عـەرەبییەكان | | |
| | موسوعة : الإســـلام كما يتجلّى فـي كـتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| | كە لە چـاپی یەكەمدا (٨) بەرگـەو، لە چـاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| ١٤٢ | الكتاب الأول: الإســلام: معرفة صحيحة بالخـالق عز وجل والخلـق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٤٣ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمـان | ط االثانية/٢٠١٧ | |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤٤ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٤٥ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٤٦ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٤٧ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٤٨ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٤٩ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٥٠ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٥١ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| ١٥٢ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٥٣ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٥٤ | نقض فكرة التطرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | |





| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥٥ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | ـ |
| ١٥٦ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٥٧ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ | |
| ١٥٨ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| ١٥٩ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٦٠ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٦١ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٦٢ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| ١٦٣ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٦٤ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٦٥ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |
| ١٦٦ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| ١٦٧ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ١٦٨ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأُمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى /٢٠١٨ | |

| | |
|---|---|
| ئەو کتێبانـەی لـەژێـر چاپــن | |
| تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سووڕەتی: (التکاثر) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تا کۆتایی قورئان | ١٦٩ |
| مەوسووعەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن | |
| بەرگی یەکەم: واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆکارو چارەسەر | ١٧٠ |
| بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | ١٧١ |
| بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگا و پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی | ١٧٢ |
| بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | ١٧٣ |
| بەرگی پێنجەم: پایەکانی بوونناسیی و، ڕوونکردنەوەی ئیمان | ١٧٤ |
| بەرگی شەشەم: خواپەرستیی، تەزکیە، تەقوا | ١٧٥ |
| بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | ١٧٦ |
| بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان | ١٧٧ |
| بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان | ١٧٨ |
| بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار | ١٧٩ |
| بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەکانی تەبایی و یەکڕیزیی مسوڵمانان | ١٨٠ |
| بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ | ١٨١ |

## کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
## مامۆستا عەلی باپیر

ناو: عەلی باپیر وەتمان



لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

● زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیەو سلێمانیی)و لە لای زانایانی کوردستانی عێراق و «دواتریش کوردستانی ئێران» بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپیڕی لەبەر کردوە.



● لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.

● لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو، بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.

● یەکەمین بەرهەمی لەساڵی: (١٩٨٣)زدا نووسیوە بەناوی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) پاشان کتێب و بەرهەمەکانی بەردەوام بوون کە ئێستا

ژمارەیان لەسەد (١٠٠) تێپەڕیوە، لە مەوسووعەو کتێب و نامیلکەو، بەزمانی کوردیی و عەرەبیی و، هەندێك لە کتێبەکانیشی کە بەزمانی کوردیی نووسیونی، بۆ زمانەکانی: عەرەبیی و، فارسیی و، تورکیی و، ئینگلیزییش وەرگێڕراون.

• لەساڵی (١٩٨٧ز)دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، کە لەکۆتایی حەفتایەکانی سەدەی پێشوودا ڕێکخستنە نهێنییەکانی دامەزران، چۆتە چیاو دەستی بەخەباتی چەکداریی کردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامییدا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

• لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز) داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا.

• تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

• لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی نارەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلي في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسیی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بوو.

• تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێب و نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس و ئەخلاق و، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکان و...هتددا.



• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.





• کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.

• ئێستا پرۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردوەو، تا ئێستا چەند بەرگێکی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:

www.alibapir.net



## نێوەڕۆک

# بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ

ئەم کتێبە ئامانج لێی دەستنیشانکردنی ئەو پایە و بنەڕەتانەیە، کە مسوڵمانەتیی و دیندارییەکی ڕاست و هاوسەنگیان لەسەر بنیات دەنرێ، لە ژیانی تاك و کۆی مسوڵمانان دا، بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، ئنجا من هەوڵم داوە گرنگترین و سەرەکییترین ئەو بنەڕەتانە، لە سی و یەك (31) دانەدا، کورت بکەمەوە.

بۆیەش گوتوومانە: {مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ} چونکە:

مسوڵمانەتیی و دینداریيەك لە لای خوای تاك و پاك، پەسندە، کە لە ڕووی خودو چییەت (ذات و ماهيَّە)وە، ڕاست و تەواو بێ و، لە ڕووی شێوەو چۆنیەتیی (شكل وكيفية)وە، هاوسەنگ و نەلەخشاو بێ، هەڵبەتە هەتا لە کتێبی موبارەکی خواوەش نیزیکتر بین و، کارلێکی چاکتری لەگەڵدا بکەین، دینداریی و مسوڵمانەتییەکەمان ڕاستتر دەبێ و، هەتا بە ڕێبازی(محمد) پێغەمبەریشەوە صلی الله علیه وسلم، پابەندتر بین، پێی ئاشناتر بین، مسوڵمانەتیی و دینداریيەکەمان، هاوسەنگتر دەبێ.



www.alibapir.net
/alibapir1
/alibapir




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice